# ئەدەبی سەردەم

ئەدەبی سەردەم



گۆڤارێکی
ئەدەبی
هونەری
ڕەخنەییە

خاوەنی ئیمتیاز



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم





گرافیك دیزاینر ئارام عەلی

سەرنووسەر هیوا قادر

ساڵی دووەم

ژمارە

7

adabiserdam@yahoo.se

نرخ 3000 دینار

## مەلەفی تایبەت:
## شێرکۆ بێکەس







## هیوا قادر

ئەو ژیاندۆستی و بینینە جیاواز و تینوێتییە بۆ کەشفکردن، وایکردووە هەمیشە تەمەن کورترین شاعیر چەندان جار لە بەتەمەنترین ئینسانی ئاسایی تەمەن درێژتربێت؛ ئینسانەکان بەهەموو جیاوازییەکانیانەوە لە ساتی نزیکبوونەوەیان لە مردن لەیەك ئەچن، ئەو لەیەکچوونەش لە تەنهاییانەوەیە، چونکە هەموو ئینسانەکان بەتەنهایی ئەمرن. بەڵام کاتێك شاعیران و نووسەران هەست بە نزیکبوونەوەی مردن ئەکەن، بە چاوێکی غەمبار و زەردەیەکی سارد و سیمایەکی بێدەنگەوە سەیری هەموو شتەکانی دەوروبەریان ئەکەن. دواهەمین بینینەکانی پێش مردن لە هیچ بینینێکی ناو ژیان ناچێت و پڕە لە پرسیاری بێ وەڵام. هەستی هەستکردنی ئینسان بە گوناهبوونی خۆی لەبەردەم مردندا هەزاران جار گەورەترە لە هەستکردن بە گوناهبوون لە ژیاندا، ڕەنگە دواهەمین هەناسەی دەمی مردن هەوڵدانێك بێت بۆ گوزارشتکردن لەو گوناهبوونەی ئینسان لەبەردەم قەدەری مردنی خۆیدا.
شاعیرەکان لە هەرە ژیاندۆسترینیانەوە تا غەمبارترینیان بوونەوەری زۆر تەنها و بریندارن، ئەم برینداریەش لەو خولیایەیانەوە دێت بۆ کەشفکردنی شتەکان لە ڕێگای زمانەوە، داهێنەرترینیان هێشتا هەست بەوە ئەکات ئەوەی ئەیڵێت و ئەینووسێت بەس نییە، ئەم بەس نەبوونە لە هەموو ئاستەکاندا مایەی زیاتر قوڵکردنەوەی ئەو برینداریییەیە؛ کاتێك شاعیرەکان بەو برینداریییەوە بەجێماندێڵن، توشی بێدەنگی و غەمبارییەکی قووڵمان ئەکەن. کاك شێرکۆ یەکێك بوو لەو شاعیرانەی زۆر بریندارانە بەجێیهێشتین و دوای خۆی زۆر غەمبار و تەنهای کردین؛ ئەو ئەیزانی مردن نزیکە، بەو غەمباریی و خەمۆکی و دڵپڕبوونەی ڕۆژانەیدا دیاربوو، من چەند مانگێك بوو دڵم پێی وتبووم تێر وپڕ سەیری بکەم چونکە ئەمزانی بەو زووانە ئەڕوات و ناگەڕێتەوە، ئەو کاتانەی بینی کۆکە ئەیگرت و ئەیتاساند و توشی هەنەدەفی ئەکرد، مردن وەك سێبەرێك ئەیویست دەستی بگرێت و بۆی نەئەگیرا.
ئەو بەیانییەم لەبیرە چەند مانگێك پیش سەفەرەکەی، بە زەحمەتێکی زۆر بەسەر قادرمەکانی قاتی یەکەمی دەزگای سەردەمدا سەرئەکەوت، بێ ئەوەی بهێڵم بمبینێت من لە دوایەوە بووم و دڵم پڕبووبوو، ئەمزانی ئەو سەرکەوتنەی بەسەر ئەو پێ پلیکانە نەفرەتیانەدا کە شەکەتیان کردبوو، هەنگاوهەڵهێنانەوە نییە بۆ ناو ژیان بەڵکە تلبوونەوەیە بەرەو مردن. من ئێستا لەسەر ئەو

# نەزانینی بۆ کویێ ڕۆیشتنی دوای مردن، گەورەترین و ئاڵۆزترین پرسیاری غەمباری ئینسانە؛ من لە ئێستادا پێویستم بە هیچ وەڵامێك نییە بۆ ئەم پرسیارە، تەنها پێویستم بە بێدەنگییە.

پێ پلیکانانە دانیشتووم و بەبێدەنگی بیرئەکەمەوە؛ ئەبێت چاوی ئەو پیاوە شاعیرە بریندارە، خەیاڵ و تیڕوانینەکانی چەندە بەرابەر لە جاران تینووتربووبن بۆ بینینی هەموو شتەکان، ئەبێت ئەو هەستی بەجێهێشتنی یەکجارەکییە چەندە جەرگ بڕ و ئەژنۆ شکێن بووبێت، ئەبێت ئینسان لەویادا چەندە هەست بە تەنهایی و دەستەوسانی بکات کە ناتوانێت ئەو ساتانە بکات بە تێکست، دوا ساتەکانی بەجێهێشتنی یەکجارەکی بۆ نا شوێن؛ چەندە بێ ڕەنگ و سارد و بەتاڵن لە گوزارشتکرن. ڕەنگبێت سیحری ژیان و ئومێدی ژیان لەویادا هێندە بەهێزبێت شاعیر فریای بە تێکستکردنی ئەو ساتانە نەکەوێت و لەبری ئەوە دڵی پڕ لە ئومێد بکات و لەناو خەیاڵی مانەوەدا خۆی بشارێتەوە. یان ڕەنگە جەستە هێندە سست و خەیاڵ هێندە بێ باڵ و لەزەتبردن لە نووسین هێندە دووربێت کە نەتوانێت ئەو دواهەمین ساتانە بگوێزرێتەوە بۆ ناو دنیای تێکست. هەر ئەبێت وابێت، گەر نووسین بەشێك بێت لە ژیان، ئەوا نووسین لەو کاتانەدا ئەبێت بە ژێر ئازار و خەمی تەنهایی مردنەوە، بەڵام کاك شێرکۆ پێش گەیشتنی یەکجارەکی ئەو ئازاری مردن لە دواهەمین دیوانیدا "خێراکە مردن خەریکە بگات" ئەوەندەی توانی شاعیرانە قسەکانی خۆی کرد، ئەوسا چاویلکەکەی دانا. ئەم بینینانەی من باسیان ئەکەم سەبارەت بە گەیشتنی مردن سەدان جار کۆپیکردنی ئەو هەستە ئاڵۆز و سەیرانەی پێش مردنن کە من ئێستا لە بەرزاییەکانی ژیانەوە ئەیانبینم.

ـ کاك شێرکۆ کاتێك قەسیدەی "پایز لە ناو پایز دا"ت بۆ خوێندمەوە، وتم: ئەم شیعرەت زۆر زۆر غەرمبارە! پێتووتم: غەمبارە! ئا وایە، بڵێین چی، تازە پایز هاتووە و منیش هەستەکەم وەك گەڵا کەوتوومەتە دەم با، ئیتر ژیان وایە، هەمووومان ئەبێت قسەی خۆمان بکەین و بڕۆین.

من هەرگیز مردن بە حەق نازانم، مادام شاعیرەکان ئاوا بە بریندارانە بەجێماندێڵن.
بیرتەکەم کاك شێرکۆ



# شێرکۆ بێکەس

مەلەفێکی تایبەت
بۆساڵیادی شێرکۆ بێکەس
شاعیری جوانی و ئازادی

یەکەم نووسینی شێرکۆ بێکەس لە زنجیرەی پێش خستن و زیندو کردنەوەی ئەدەبی کوردی ژمارە ـ٤ـ ساڵی 1956

« دەمیکە نەم دیویت ، دل گەلی بەپەروشە »
« چاویش هەر چاوە نوارتە ، بەلکو لە موچیکەوە »
« دەرکەویت ، کەچی بی هودەیە ئەو چاوە نوارییە !! »

* * *

ورده ورده هەنگاوم ئەنا بەرەو مالەوە ، ئەمەویست خوم بخافلینم چونکە لە جاران زووتر اسرو گەرامەوە کارخانە . هاتم تا گەیشتمە ئەو شەقامەی کە هەموو روژیك لەم کاتەدا چاوەروانی ئەکەم ، چاوە روانی ئەم جوانە ئەکەم کە خوشم ئەوی ! هەموو روژی پیویستە بو بینم وە تینوەتی دلم بشکی ! کاتی لەقوتابخانە ئەگەریتەوە دیـــا زور گەرمە تاك تاك مروڤت بەسەر شەقامەکانەوە ئەدی . . پاش چاوە نواریکی زور خوم لەگەل خوما وتم بەلکە هەندی دەنگیشم هەل بری بەلام هەر لیوم ئەجولا :

« گیانە شیرینەکەم . دەمیکە نەم دیویت . دلە گەلی بە پەروشە . چاویش هـــەر چاوە نوارتە ، لەسەرت بەنگە . کە لەموچیکەوە دەرکەویت . کەچی بی‌هودەیە . هـاوری یەکانت لەسەری شەقامەکە دەرکەوتن بەلام توی لەبەینانیت . جاران کەدەر ئەکەوتیت لەگەلیانا وەك مانگی بویت کە گەلی ئەستیرە دەوری دا بیت . بەلام ایرو ئەستیرەکان هەلە هاتن بەلام مانگی هەل نەهـــات بو دەرئەکەوتی خوزگە ئەمزانی . . .

دلم زور بەسەزرەتەوەیە بو بینینت بەچاو چونکە ئەو پەرەرەشەی لە آزارو مەینەتو نا خوشي بەسەریا کشاوە بەلکو بە بی ئیلت نەختی

# پاییز
# لەناو
# پاییزا...!

## شێرکۆ بێکەس

تا پاریش، پاییز هەر
لەو دیوی دەروازەی حەوشەوە
لە کۆڵان، قژ و پرچ، خۆڵاویی
لەگەڵ «با» ئەوەستا و هەندێجار
دوای باران
لە درزی باریکی
پەردەکەی تەمەوە
تەماشایماڵەکەی ئەکردم!

تا پاریش، پاییز هەر
لە ڕێگەی تریفەی تەزیوی مانگەوە
دووراو دوور هەر بە سەر
سڵاوی ئەنارد و
زۆرجاریش لە پووش و پەڵاشی
وەڕس و بێزاری
دەشتی بۆ... ئەناردم.
شەوانیش درەنگان
خەیاڵم ئەترسا و
لە باوەش خەزانیا ئەنووستم!

یەکەمجار... من دایکم

له سیلەی ڕۆژێکی بەدبەختی
وەك خۆیدا
پاییزی نیشاندام
ئەوساکە تەمەنم لە خونچەی
گوڵەباخ کەمتر بوو!
پێی وتم:
پاییزیش وەك منە و بێوەژن
تەنیایە و دڵشکاو
حەز ئەکەم ئەویشت هێندەی من
خۆشبوێ و
چون نان و
چون نوقڵ و
چون سوخمە زەردەکەم
بیخەیتە سەر چاوان.
پێی وتم:
پاییزیش وەك باوکت شاعیرە و
بەڵام ئەم شیعری خۆی
هەمیشە هەر لەسەر
گەواڵەی کۆچەر و
تەوێڵی گردۆڵکەی ڕووتەن و
گەردن و سەرسنگی
درەختی ڕووت قووت ئەنوسێ!.
پێی وتم:



هەناسەی غەریبی
لە ڕەنگی پاییزدا
نیشانەی عەشقێکە سرمدی و
خەمێکە تا ئەبەد
ئەلەرزێ و ئەسووتێ!.
پێی وتم:
بۆ ئەوەی تەماشات
تێکەڵی تەماشای خوا بکەی
بچیتە نهێنی بوونەوە و
لە کۆچ و لە عەشق و
لە سەراب
تێبگەی:
هەر ئەبێ لای پاییز بخوێنی و
ڕەنگی خۆت
بە ڕەنگی حەسرەتی
ڕەنگبکەی!

تا پاریش پاییز هەر
لەو دیوی دەروازەی حەوشەوە
چون پرسیار ئەوەستاو
ناو بە ناو
شیعرمان بۆ یەکتر ئەنارد و

١٣

جار بە جار شەوانە
وشەمان ئەتەزی و ئەیبەست و
ڕۆژانەیش لە بەردەم
هەتاوی لاواز و نەخۆشدا
پەیکەری مەراق و ڕامان بووین
چاوەڕوان پێکەوە
بەرامبەر بە نادیار
ئەوق ئەبووین، دائەماین.

وا ئەمساڵ
چون باخی ئاوارە.. بێ پرس و
بێ ئەوەی کە پێشتر
زەنگێکم بۆ لێدا و پێمبڵێ
هاتۆتە ماڵەوە و لەگەڵ خۆی
وەك دیاریی
باوەشێ لە شیعری زەردەڵەی
هێناوە
بۆ شەوی تەنیایی ژوورەکەم!.
وا ئەمساڵ
هاتۆتە لامەوە و
بە پڕمەی گریانی درشتی ڕێژنەی
قەڵەم و دەفتەر و
ئەلبووم و خەیاڵ و



خەمانم تەڕئەکا و
هەروەهایش پێخەف و چرپاکەم!.

تا پاریش پاییز هەر
لەو دیوی حەساری لەشمەوە
وەستابوو
ڕێی نەبوو
کە بێتە ناو ژووری لەشمەوە
دەسکاری دەروون و پەنجەرەی
هەست و نەست بکات و
ڕێی نەبوو
ناوەوەم داگیرکاو
هەست بکەم ڕەنگێکی کۆیلەم.
هەست بکەم من ئیتر خۆم نیم و
تەواوی تەمەن و جەستەمی
وەك (مانگ) ی
ناو گۆمی حەپەساو
تەسلیم کەم

بەڵام وا لەمساڵدا
هاتۆتە ماڵمەوە و هاتۆتە دڵمەوە و
چیبوێ ئەیکات و کونج بە کونج
بە کوچە و شەقامی ناو لەشما ئەگەڕێ و

وەك باخان پژوپۆم ئەڕنێ و
نایشتوانم چون خەزان
لەگەڵیا هەڵنەکەم!
ئەوەتا وا پاییز
هاتۆتە چاومەوە و لەگەڵیا
چڵ بە چڵ
تاڵ بە تاڵ
مووی سەر و تەماشام
ئەوەرێ.
ئەوەتا وا پاییز
هاتۆتە ناو سیما و ناو لۆچی
ڕوخسارم و
سەر شان و سەر ملم و
کێومالْم ئەکات و
لە کوێدا تۆزقاڵێ لە بەهار
جێمابێ
بۆ ئەوەی زەردیکات
بە ناویا ئەگەڕێ.
وا پاییز هاتۆتە سەر پشتم و
کەپری خۆی ئەبەستێ.
هاتۆتە ئێسکمەوە و
مووەغەم ئەسوێنێ و
بڕبڕەم خەریکە



وەك لقی دارێكی ئێوارەی وشك ئەبێ و
ئەنەوێ.
وا پاییز ماسولكەم شل ئەكا و
كردوێتی بە پەڕۆ و
ڕۆیشتنم چون گەڵای ڕژاوی
بەر بای سارد
خشەی دێ و
چاویشی بە وردی
دەزوولەی قرچۆكی
هەنگاوی بووڵێڵم ئەژمێری.

من و ئەو
پاییزی ناو پاییز
ئێستاكە هەردووكمان
نیشتەجێی ماڵێكین
هۆدەمان یەك هۆدەی خەزان و
چرپامان یەك چرپای
هەناسە ڕێزان و
شیعرمان یەك شیعری
كۆچ ڕەوی ناو زەردەی ئێواران.

من و ئەو.. پاییزی ناو پاییز
وەلێ ئاخ.. من ئەبێ ماڵەكەی

بۆ چۆڵکەم
من ئەڕۆم.. ئەو ناڕوا و
دواجاریش ئەو لەسەر چرپاکەم
ئەخەوێ
وەلێ ئاخ... ئاخ و ئاخ
من
ئەمرم.
ئەو
نامرێ!

سلێمانی

پاییزی ٢٠١٢



# شێرکۆ بێکەس لە دەرەوەی سنوری کوردستان

**میران ئابراهام**

پێشەکی

خەڵاتی ئاشتی "ئیپر"، ئەم خەڵاتە بۆ پێنجەمین جارە لە فیستیڤاڵی هونەری و ڕۆشنبیری شاری ئیپر لە وڵاتی بەلجیکا دەبەخشرێت بەو کەسایەتی یان ڕێکخراوانەی کە کۆشش دەکەن لە پێناوی ئاشتی و پاراستنی مافی مرۆڤدا لە سەرانسەری جیهاندا، ئەو دەزگایە بۆ ساڵی **2014** پێنج کەسی دەستنیشان کرد بۆ کێبڕکێ کردن لە سەر خەلاتی ناوبراو، یەکێك لەو پێنج کاندیدە شێرکۆ بێکەس بوو، لە دوو ساڵی ڕابردوودا کارمەندانی دەزگای ئیپر بۆ ئاشتی گەلێك زانیارییان لەسەر ئەو پێنج کاندیدە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ماڵپەڕی سەر بە دەزگای ناوبراو بڵاو کردەوە، کار و چالاکی و ژیاننامە و چەندین شیعری شێرکۆ بێکەسیشیان بڵاو کردەوە، لەگەڵ لێدوانێکدا کە من لە زمانی هۆڵەندییەوە لێرەدا کردومە بە کوردی، کە کارمەندێکی ئەو دەزگایە لە ساڵی **2013** دا لەگەڵ شێرکۆ بێکەس-دا ئەنجامی داوە، لەگەڵ لێدوانەکەدا تەنها ناوی دەزگاکە و کورتەی ناوی ئەو کارمەندە نوسراوە بەناوی "مۆو"، هەفتەیەك پێش فیستیڤاڵی شاری ئیپر و ڕۆژی بەخشینی خەڵاتەکە شێرکۆ بێکەس لەشاری ستۆکهۆڵم کۆچی دوایی کرد و خەلاتی ناوبراو بەخشرایە خانمی لاوی پاکستانی "مەلالا".



دە ساڵێك پێش ئەمڕۆ لە شاری خرۆنینگن لە وڵاتی هۆڵەندا، لە دەمەو ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی یەکی بەهاری ئەو ساڵەدا ڕێم کەوتە کافتریایەك "ئاودە بانك"، دیواری هەرچوارلای ئەو کافتریایە داپۆشرابوون بە تابلۆی هەمەجۆر و ڕەنگاوڕەنگ، تەنانەت سەقف و ئەرزەکەیشی نیگاریان لەسەر کێشرابوون، لەسەر ڕەنگەکان ناوبەناو کورتە چیرۆك یان شیعر نوسرابوون، دەتگووت لەسەر باڵی پەلکەزێڕینەم و لەوێوە لە جیهان دەڕوانم، سەرەتا سێ گەنجی سکۆتلەندی گیتاریان ژەند بۆ ئامادەبوان، لەکاتێکدا من کە بۆ یەکەمین جارم بوو ڕێم بکەوێتە ئەو کافتریایە، چاوەڕوانی ئەو موزیك ژەنانەی ترم دەکرد کە بە خۆیان و کەرەستەی موزیکەکانیانەوە لە چواردەورم بوون و لە بارەی موزیکەوە دەدوان، لە ناکاو ئافرەتێکی بەتەمەن مایکرۆفۆنەکەی لە ناو دەستی گرت و پاش داوای یارمەتی کردن لە هەموان، بەردەوام بوو گوتی: هاوڕێ و میوانانی ئازیزم، ئەگەر یارمەتیم بدەن دەمەوێت چەند شیعرێکی شاعیرێکتان پێشکەش بکەم، شاعیری میلەتێکی بێ وڵات، شاعیری کورد شێرکۆ بێکەس، ئەو شاعیرەی من خۆم زۆر سەرسامم بە شیعرەکانی. من لە جێگای خۆمەوە ئارەقێکی سارد هەموو لەشی خوساندم و خوێنم لەپەسا شەپۆلی بەگوژمی خۆی بە دیواری دەمارەکانمدا دەدان. پێش خوێندنەوەی شیعرەکان، کۆپی شیعرەکانی بەسەر کۆی ئامادەبوانی ناو کافتریاکەدا دابەشکرد و پاشان دەستی کرد بە خوێندنەوەی چەند کورتە شیعرێکی شێرکۆ بێکەس، یەکێك لەو شیعرانە "جودایی/ **Scheiding**" بوو. هەمان شیعر لەسەر یەکێك لەدیوارەکان لەسەر پاشبنەمایەکی ڕەش بە خەتێکی سپی نووسرابوو. خوێنەری شیعرەکانی شێرکۆ لەو کافتریایە کرستڵ ئەڵشۆت کە خاوەنی کافتریاکەیە و زیاتر لە سی ساڵە کافتریاکەی کردووە بە سەکۆیەك بۆ نمایش کردنی هونەر و ئەدەبی ناوازە و هەڵبژاردە، بەتایبەتی خوێندنەوە و لێدوان لەسەر شیعر و کورتە چیرۆك.

جودایی

ئەگەر لەناو شیعرەکانما
گوڵ دەراوێژنە دەرەوە
لە چوار وەرز، وەرزێکم ئەمرێ
ئەگەر یار بێننە دەرەوە



ئەدەبی بەردەم

# VREDESPRIJS IEPER
dienst vrede & ontwikkeling

دوانم ئەمرن.

ئەگەر نان بێننە دەرەوە

سیانم ئەمرن.

ئەگەر ئازادی بێننە دەرێ

ساڵم ئەمرێو خۆیشم ئەمرم.

**Scheiding**

**Nemen ze uit mijn poëzie de bloemen**
**dan sterft een van mijn seizoenen**
**Nemen ze uit mijn poëzie de liefde**
**dan sterven twee van mijn seizoenen**
**Nemen ze uit mijn poëzie het brood**
**dan sterven drie van mijn seizoenen**
**Nemen ze uit mijn poëzie de vrijheid**
**.dan sterft mijn hele jaar en ik daarbij**

لەدوای ئەو ئێوارەیەوە من و ئەو ئافرەتەی هەردەم سەرسام بوو بە شێرکۆ بێکەس بووینە هاوڕێ، لە دە ساڵی ڕابردوودا هەموو هەفتەیەك لەگەڵ کرستڵ-دا پێك گەیشتووین و لێدوانمان هەبووە، هەموو جارێك شێرکۆ-و شیعرەکانی هەوێنی گفتوگۆکانمان بوون، هەر ئەویش پێش هەموو کەس و ڕۆژی کۆچی دوایی شێرکۆ زەنگی بۆ لێدام و ئاگاداری کردمەوە.

کورتەی هەواڵی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بەلجیکا و هۆڵەندا لە هەفتەی دوای کۆچی دوایی شێرکۆ-دا:
شاعیر و شۆڕشگێڕ و چالاکەوانی بوارەکانی مافی مرۆڤ شیرکۆ بێکەس کۆچی دوای کرد.
کۆمیتەی هەڵبژاردن بۆ خەڵاتی ئاشتی لە شاری ئیپر لە وڵاتی بەلجیکا، بۆ پێنجەمین جار لە مێژووی ئەو دەزگایەدا پێنج کەسی ناوداری لە سەرانسەری جیهاندا دەست نیشانکرد بۆ کێبڕکێی بردنەوەی ئەو خەڵاتە بۆ ساڵی **2014**، یەکێك لەو کاندیدانە شاعیر و شۆڕشگێڕ و چالاکەوانی بوارەکانی مافی





مرۆڤ شیرکۆ بێکەس بوو، چەند هەفتەیەك پێش ئەوەی کۆمیتەی ناوبراو کاندیدی یەکەم دەستنیشان بکات، یەکێك لەو پێنج کادیدە کە شێرکۆ بێکەس -ە لە تەمەنی **73**ساڵیدا لە نەخۆشخانەیەکی شاری ستۆکهۆڵم لە وڵاتی سوید کۆچی دوایی کرد، کۆمیتەی خەڵاتی ئاشتی ئیپر ئەم هەواڵەی بە میدیاکانی وڵاتانی بەنەلوکس ڕاگەیاند، وەك هاوپێچ لەگەڵ ئەو هەواڵەدا... کۆمیتەی ناوبراو ڕایگەیاند: کۆمیتەکەمان، هەواڵی کۆچی دوایی کاندید شێرکۆ بێکەس ڕادەگەیەنێت، سەرجەم دۆکۆمێنت و ژیاننامە و کارەکانی بێکەس کە لە لایەن کارمەند و دۆستانی کۆمیتەکەمانەوە لە ساڵانی ڕابردوودا کۆکراونەتەوە، لە بەرنامەی ئەمساڵی کار و چالاکی کۆمیتەکەماندا دەمێننەوە و گرنگیان پێدەدرێت، تاکو ڕۆژی دابەش کردنی خەڵاتەکە، لە ئاهەنگی ڕۆژی پێدانی خەڵاتیشدا بێکەس وەك سیمبۆڵێك بۆ خەڵاتی ئاشتی ئیپر ناوزەند دەکرێت و سەری ڕێز و نەوازش بۆ ئەو مرۆڤە مەزنە دادەنەوێنین، تاکو ڕۆژی کۆتاییش پێنج کاندید ناویان دێت و بێکەس لە ڕیزی ناو لێنراواندا دەرناکرێت، بەڵام خەڵکی بەلجیکا و لێژنەکە دەتوانن دەنگیان بدەن بە تەنها چوار کاندید، زانیاری و ژیاننامە و شیعرەکانی بێکەس وەك ڕێز لێنانێك بۆ ئەم شاعیرە مەزنە شۆڕشگێڕە لە کارو بەرنامە وناملیکە و پۆستەر و ماڵپەڕی فەرمیماندا دەمێننەوە.

لە ماڵپەڕی ڕەسمی ماڵپەڕی خەڵاتی ئاشتی ئیپر دا بێجگە لە ژیاننامە و چەندین شیعری شێرکۆ بێکەس لێدوانێکیشیان بڵاو کردۆتەوە، دەقی لێدوانەکە:

**مۆو: ڕۆژی 11 ی فێبریوەری** 2011 **چۆن لە شاری سلێمانی سەنتەری هونەر و ڕۆشنبیری لە کوردستان، سەرهەڵدان و دەنگی ناڕەزایی ڕوویدا، ئایا هۆکارەکانی ئەو ناڕەزاییانەی خەڵکی ئەو شارە چیبوون؟**

**بێکەس:** ناڕەزاییو خۆپیشاندانەکانی ئەم دواییەی شاری سلێمانی، بێگومان چاوەڕوان کراوبوون، شتێکە دەمێکە خەست بۆتەوە لە کودستان، لە ناو خەڵکدا بیروڕای جیاواز هەن، بەڵام لە ئەنجامدا دەگەینە ئەو خاڵەی کە گوێ لە سەرجەمی دەنگەکانی خەڵك ناگیرێت، بۆ نموونە کێشەی دزیو بردنی سەروەتو سامانی وڵات، ناو نەهێنانی هەژاریو بێکاری، دەسەڵات کوێرە لە بەرانبەر کێشەکانی خەڵکدا، بێگومان خەڵك هیچ ڕێگاچارەکی تریان لەپێش نییە تەنها

ئەوە نەبێت بڕژێنە سەر شەقامەکانو داوای مافەکانیان بکەن لە دەسەلأت.

**مۆو: ناڕەزاییەکان لە کوردستان ناوچەیین، تەنها لە سلێمانیو چەند شارۆچکەیەکی سەر بە پارێزگای سلێمانی بوون، لە هەولێرو دهۆک... ئەو دوو شارە گەورەیەی تری کوردستان، بۆ تەنها سلێمانی ناڕازییە لە دەسەلأت؟**

**بێکەس:** سلێمانی تا ڕادەیەك شارێکی لاوە، لەسەرەتای دروستبوونییەوە تاکو ئەمڕۆ بەردەوام دڵی کلتوورو سیاسەت بووە لە کوردستاندا، دەتوانم بڵێم هەموو جوڵانەوەیەکی سیاسی لە مێژووی گەلی کورددا لەم شارەوە دەستی پێکردووە یان کەم تا زۆر مۆرکێکی بیری خەڵکی ئەم شارەی پێوە بووە، سەرهەڵدانی ساڵی **1919** دژی ئینگلیزی داگیرکەری کوردستان، هەروەها سلێمانی یەکەم شاربوو سەرهەڵدانی کردو دژی سەدام ڕاپەڕی، هەر بۆیە جێگای گومان نین ئەوەی ئێستا لە سلێمانی ڕوودەدەن، ئەمە ڕەوشتی ئێمەی خەڵکی ئەم شارەیە، بەلأم لە هەولێرو دهۆك-یش خەڵکانێك هەن کە بێزارن لە سیاسەتو کردەوەی دەسەلأت، بەلأم ڕێگایان پێنادرێت بێنە سەر شەقامو داوای مافی خۆیان بکەن، دەسەلأتی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە هەولێرو دهۆك زۆر بەهێزترە وەی لە شاری سلێمانیدا، بێگومان لەژێر دەسەلأتی پارتیدا هەردەم دەنگەکان سەرکوت کراون.

**مۆو: پارتی و یەکێتی زیاتر لە بیست ساڵە حوکومڕانی هەرێمی کوردستان دەکەن، تا چەند ئەم دوو پارتە بەهێزنو ڕەگیان لەناو کۆمەڵگای کوردیدا داکوتاوە؟**

**بێکەس:** شەڕی ناوخۆ لەنێوان (پارتی و یەکێتی)دا کە لە ساڵانی نەوەدەکانو پێش ئەو ساڵانەدا ڕویاندا، لاپەڕەیەکی ڕەشە لە مێژووی میللەتی کورددا، هەرگیز ئێمەی کورد شازیی پێوە ناکەین، شوکور ئەوان ناچار کران ڕێبکەون و دەسەلأت بەش بکەن، هەرچەندە لەنێوان ئەو دوو پارتەدا تاکو ئەمڕۆیش ئاسەواری ئەو جەنگەو گرژیو پێباوەڕی بە ئاشکرا دیارە، لەوەدا دەبینرێت کە حکومەت کارتۆنییەو دەسەلأتی تەواوی لانییە، بەڵکو دەسەلأت لای سەرکردەکانی ئەو دوو پارتەیە، هەموو بڕیارێك لەلایەن سەرکردەکانی ئەو دووپارتەوە دەردەچێت، کاریگەرییان بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە لە کودستان، ئەو دوو پارتە ڕۆژنامە و گۆڤار و چەندین تەلەفزیۆنی تایبەت بە خۆیان هەیە... چاودێریشن بەسەر میدیای گشتییەوە، بازاڕو بازرگانی ولأتیان تەواو داگیر کردووە، چەندێك پارتی لەگەڵ یەکێتی (پێشمەرگە بوون، کە بەمانای پێش مەرگ



کەوتن)دێت، ئەو پێشمەرگانە تاکو ئەمڕۆیش سەرەجەم لەژێر کۆمانۆی پارتی و یەکێتیدان، لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەت، هەر پارتەو سەربازی دەزگای نهێنی خۆی هەیە. کوردستان وڵاتێکی دەوڵەمەندە ماڵی نیشتیمانو نەوتەکەی ئاوابێت، بێگومان داهاتەکەی لە نێوان ئەو دوو پارتەدا دابەش دەکرێت، چەندین ساڵە نەوە لە دوای نەوە خەویانە بەشداربن لە کوردستاندا بەتایبەتی لە سیاسەتی وڵاتدا، هەموو ساڵێك سەدان لاو لە زانکۆکانی کوردستان دەردەچن، بێ ئەوەی بەختیان بەرکەوێتو کاریان پێبدرێت.

**مۆو: کوردی کوردستانی عێراق نموونەیەکی تا ڕادەیەک سەرکەوتووە لە ناوچەکەدا، لە دوورگەیەک دەچێت بۆ نموونەی دیموکراتی لە ناو دەریایەک لە دیکتاتۆرییەتدا، کە وا دیارە، سەرۆکی حکومەتی هەرێم مەسعود بەرزانی لە مانگی دووی ئەمساڵدا خەڵاتی ڕێزلێنانی "ئەتلەنتیک"ی پی بەخشرا، ئایا ئەوە تەنها ڕوکەشە؟**

**بێکەس:** ئەم پرسیارە پێویستە لە کەسانێکی سیاسەتکاری بکەیت، ئەگەر ئەو دوو پارتە هەموو شتێکیان کۆنترۆڵ کردبێت، چۆن دەتوانی ناوی دیموکراتی بێنین، بەڵام تەنها دەتوانین بڵیین جێگایەك یان هەرێمێکی ئارامەو بەدوورە لەو نائارامیو ڕەشەکوژییەی عێراقی کاول کرووە، بەڵام ئەوە کوردستان بە دیموکراتی ناکات، ڕای خەڵكو دەنگی گشتی خەڵکی کوردستان لە ژێر گوشاردایە، لە هەولێر و دهۆك تاکو ئەمڕۆیش یاساغە خۆ پیشاندان بکرێت، من ئەوە ناونانێم سەربەستیو دیموکراتی.

**مۆو: سیاسەتێکی ئۆپۆزسیۆنی بەهێز بوونی هەیە لە کوردستاندا؟**

**بێکەس:** بزوتنەوەی گۆڕان ئێستا لە گەشەو تافی لاوی خۆیدایە، بەڵام ئێستا زۆرینەی دەنگە ناڕازییەکان کە ناڕەزایی دەردەبڕنو دەڕژێنە سەر شەقامەکان، بەزۆری ئەو گەنجانەن کە لەگەڵ هیچ بزوتنەوەو پارتێکدا نین، لە کاتێکی وادا گۆڕان و پارتە ئیسلامیەکان هەلەکە دەقۆزنەوەو دەنگی خۆیان تێکەڵ بە ناڕازییەکان دەکەن.

**مۆو: ئەوەی کە زۆر گوێمان لێی دەبێت... بنبڕکردنی دزیو بەهەدەر نەدانی سامانی وڵاتە؟**

**VREDESPRIJS IEPER**
dienst vrede & ontwikkeling

**بێکەس:** دزیو بەهەدەردانی سامانی وڵات لە تەواوی وڵاتدا دەکرێت، لە حکومەتو وەزارەتەکانیدا، لە ناو پارتەکاندا، ئاسەواری ئەو کردەوەیە لە هەموو جێگایەك دیارە، زۆرینەی سیاسەتمەدارەکان ملوێنێرن، کە هەمووومان دەزانین دەساڵێك پێش ئێستا هەموو ئەوانە لەو شاخانەبوونو بێماڵو ڕەشو ڕووت بوون، شتی وا چۆن دەبێت، حکومەتی هەرێمی کورستان تەمەنی بیست ساڵێکە، بێگومان داهاتی مانگانەی سیاسەتمەدارەکان خەیاڵییە، بێگومان سیاسەتکردن باشترین ڕێگایە لە کوردستان بۆ خێرا دەوڵەمەند بوونو کۆکردنەوەی سەروەتو سامان،

حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك کۆمپانیایەکی بازرگانی خێزانیی وایە، کێ دەسەڵاتی بەدەستە و کارمەندە لەو حکومەتەدا، یان کوڕی، برای، زاوای، خزمی، پیاوی فلانە سیاسەتمەدارە، لە دەرەوەی ئەو پەیوەندیانەدا زۆرینە بێبەشو بێکارن، خەڵکی کوردستان کوێرنین، بێگومان ژیانی ڕۆژانەیان بە کۆێرەوەری دەگوزەرێنن، خەڵکی لە دزیو گیرفان پڕکردنی دەسەڵاتداران تورەو بێزارن.

زۆرینەی کاربەدەست و سیاسەت کارەکانی کوردستان دزو گیرفان پڕکەرن ئەوە ڕوون و ئاشکرایە، هۆکاری ناڕەزایی خەڵکی کوردستانیش لە سەرهەڵدانەکانی تری ناوچەکە دەچن، بۆ نمونە میسر و تونس کە چاوی خەڵکی ناوچەکەیان کردەوە، لە ڕاستیدا هۆکاری ئەو خۆپیشندانو ڕاپەڕینانە یەك هۆکارن، ئیتر لە سلێمانی بێت یان بەغداد یان بەحرەین، یان لە هەرجێگایەکی تری ناوچەکە، هۆکاریان گوێ نەگرتنی دەسەڵاتە لە خەڵکی ئەو وڵاتە، میدیاکانو بەتایبەتی ئەنترنێت هۆکارن بۆ گەیاندنی خێرای ڕوداوەکان، جیهانیان تەواو بچوك کردۆتەوە، نەوەی نوێ لە هەرجێگایەك بێت ئەمرۆ پەیوەندیان هەیە لەگەڵ هەموو جیهاندا.

من لە یەکێك لە گۆڤارەکانی سەر بە یەکێك لەو دوو پارتەدا خوێندمەوە، کە لە نێوان دوو کەوانەدا بە خەتێکی تۆخو گەورە نووسرابوو، هەڵبەتە بەرەو ڕووی کەسانێك کراوەتەوە کە ناڕازین لە دەسەڵاتو لێرەو لەوێ پێدەچێت بەشداریان کردبێت لە خۆپیشاندانەدا، (دوای ئەوەی پارتەکەمان ئەو هەموو خزمەتەی پێشکەش بەوان کرد، ئەوان چۆن شەرم ناکەنو دەوێرن بچنە سەر شەقامو هەرەشەی دەست لە کارکێشانەوە دەکەن لە کارەکانیان.) ئێمە ئەوە دەزانین هەموو ئەوسا لەشاخ بوون! چ پارتی چ یەکێتی، بێگومان بەرەنگارییەکی سەختیان کرد لە کوردستان، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەمرۆ چۆن و چییان بوێت لە وڵاتدا بیکەن، ئەوە ئەو مافە نادات بەوان کە هەموو شتێکی وڵات بە دارو بەردییەوە لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەنو مافی گەلیش لەبیر بکەن.





**مۆو: پێت وانییە ئەوە میراتی شۆڕشی چەکداری نەبێت کە پارتی و یەکێتی سیستەمی بەڕێوەبردنی ئێستایان لەسەر بنیاد نابێت؟**

**بێکەس:** ئەگەر تۆ لە شاخ بوویت لە سەنگەری بەرگریدا، بجەنگیت لە پێناوی سەربەستیدا، دەبێت جیاوازی بکرێت لە سیستەمی بەڕێوەبردنی ئەوساو ئێستادا، ئێستا تا ڕادەیەك گەیشتوین بەو سەربەستییە، نابێت وەکو سەردەمی شاخ بیر بکەینەوە، پارتی و یەکیتی بۆیان نییە دەسەڵاتی وڵات قۆرغ بکەن، وەزعی ئێستا، داواکاری پێویست، سیاسەتمەدارەکان پێویستە بیر لە مافی ڕەوای گەل بکەنەوە، پارتەکانی کوردستان باش دەزانن، بەڵام بەرژەوەندی خۆیان دەخەنە پێش بەرژەوەندی گەلەوە، موبارەکیش ئەوەی دەزانی، قەزافیش ئەوەی دەزانی، بەڵام گوێیان پێنەدەدا.

**مۆو: خەڵکی کوردستان بێهیوا بوون... دوای ئەوەی تەمەنێکی دوورو درێژ ڕەنج و خوێنیاندا بۆ گەیشتنیان بەم ڕۆژە؟**

**بێکەس:** بە دڵنیاییەوە تا ڕادەیەك بێهیوا بوون، ئەوەی ئێستا هەیە خەوی ئێمە نەبوو بۆ کوردستان، زۆر لە خەوو هیواکانمان نەهاتنەدی، وەنەبێت ئێمەی کورد ڕووناکیشمان لە ئاسۆوە لێوە دیار نەبێت، تروسکاییەکی کزی ئەو ڕوناکییە لێمان دەداتو لەسەر خۆیش ئەو ڕوناکییە زیاد دەکات.

**مۆو: تۆ چۆن ئێستا لە وەزعەکە دەڕوانیت؟**

**بێکەس:** من نازانم پاشەڕۆژ چیمان بۆ دێنێت، درەنگەو درەنگیش نییە، دەسەڵات هەموو کات دەتوانێت ڕیفۆرمو گۆڕانکاری بکات، (ئێمە یان بەرە و دیموکراتی دەچێن، یان بەرە و دیکتاتۆرییەت)، لەبیرت نەچێت زۆرێك کەس لە کوردستانو لە حکومەتیشدا کار دەکەنو کاریش جێبەجێ دەکەن، کوردەکانی تورکیا، ئێران و سوریا، لە ئێمە دەڕوانن وەك نمونە، کورد هەرگیز نابێت ئەم هەلە لەدەست خۆی بدات.

**مۆو: تۆ وەزیر بوویت لە سەرەتای حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، بەڵام دوایساڵێک دەست**

VREDESPRIJS IEPER
dienst vrede & ontwikkeling

**له کار کێشایەوە، بۆچی؟**

**بێکەس:** ئەوسا لە زۆر شتا هەڵەکران، لە ژێر زەبرو زۆری دەسەڵاتی ئەوسادا، چەندین ڕۆژنامەنووسو دەنگی ئازاد بێدەگ کران، گران بوو بۆ من، بەشێك بم لەو سیستەمەو لێیان بێدەنگ بم.

**مۆو: شتێکی تر... تۆ ناودارترین شاعیری کوردیتو باوکیشت شاعیر بووە، ئایا بۆ لەناو کورددا ئەوەندە شاعیر زۆرن؟**

**بێکەس:** بەدەم پێکەنینەوە، ڕاستە شاعیرمان زۆرن، بەڵام شاعیرە باشەکانمان بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، هەروەك چۆن لە ئەدەبی عەرەبیشدا شیعر لە پلەی یەکەمدا دێت، یان چۆن ڕۆمان لە ئەوروپادا لە پلەی یەکەمدا دێت، لە کوردستان ڕۆمان نووسی باشمان هەن، بەڵام بێگومان هونەری شیعر نوسین لە پلەی یەکەمدایە.

سەرچاوە:
ماڵپەڕی فەرمی خەڵاتی ئاشتی- ئیپر. www.vredesprijs_ieper.be





# شێرکۆ لەباوەڵێکی تەنەکەدا..

**ئیسماعیل حەمەئەمین**

وێنەی باوەڵێك پڕ شیعر:

لەچەند ڕۆژێکی کەمدا هەردوو بەشی بیۆگرافیای مامۆستا شێرکۆ بێکەسم خوێندەوە، سەیر لەوەدابوو، لەدوای خوێندنەوەی یاداشتەکانی "نووسین بەئاوی خۆڵەمێش"، وێنەیەك ئامادەگی هەبوو، وێنەی شاعیرێکی مێردمنداڵ بەباوەڵێکی تەنەکەی پڕ شیعر و خەونەوە، پەڕەوازە و بێ لانە و پشت و پەنا. ئەم وێنەی باوەڵە تەنەکەیە، وێنەیەکە بەدوومەوەیە و لەگەڵ هێرشکردنە سەر گۆڕی شێرکۆ بێکەس ئەم باوڵە تەنەکەیە جارێکیتر گەمارۆیدام. وێنەیەکی کاریگەرە، تیژبڕە، پڕە لە هێزی ڕەمزی و ڤیزیۆنی ترسناك، ئامادەیە لەهەموو شوێنێکدا کە یادەوەری شیعری پەی پێبەرێت. لەوانەیە کاریگەری ئەم وێنەیە لەسەر من، لەو لەبیرکردنەوەیەوە بێت، چارەنوسمان وەك نووسەرێك لەنێو کولتوورێکی کۆمەڵایەتی دواکەتوودا لەزەمەنی بێکەسی باوکەوە تازەمەنی کۆچی دوایی بێکەسی کوڕ هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەهاتووە! تەنانەت هەست دەکەم مردنی نووسەر لەم کولتوورەدا مردنێکی لەسەرخۆیە و خۆی بەدرێژایی ساڵەکانی تەمەنی درێژدەکاتەوە. ساڵانێك لەنێو خۆتدا گیردەخۆیت، لەنێو دونیای ئەدەبی خۆتدا هەموو

ڕۆژێك بەر جۆرێك لەگەمژەیی کوولتوری دەبیتەوە کە کوولتوری خێڵەکایەتی بەرهەمیهێناوە. بەردەوامیش سیاسەت فۆرمی نوێی پێدەبەخشێت. لەوانەیە وەك کامەران موکری شاعیر بەتەنها لەئوتێلێکدا لەگەڵ باوەڵە تەنکەکەماندا بمرین یاخود لەژوورە تەنهاکانی مەنفاکاندا لەبیربکرێین... ئەم باوەڵە تەنەکەیە، ئەو دونیا ئیستاتیکی و پڕ چیرۆك و شیعریەیە کەلەگەڵ خۆماندا هەڵیدەگرین و تامردن هاوەڵمانە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین هێزێکی گەورە لەم کۆمەڵگەیەدا بوونی هەیە کە بەردەوام هەوڵدەدا ئەو باوەڵە بچوکەت لێبسەنێت و تەسلیم بە سیاسەتی چەوت و هەست مردوویی نەریتەکان و دواکەتوویی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی بکات. ئەم هێزە لەزەمەنی گۆران و بێکەسی باوکدا بەزەقی ئامادەبوو، ئێستاش بەرگی سیاسەت و ڕۆژنامەنوسی سیاسی بۆ کوولتور و پارتی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە.

هەروەها لەماسکی دیموکراسدا خۆی نمایشدەکات. لەنوێترین دیاردەی پۆستمۆدێرنەدا فۆرمی ئاکادیمی وەرگرتووە و بەهەموان لەجەنگدان لە دژی ئەدەب، لەدژی ئەو سوبێکتە ئەدەبیەی لەنێو کوولتوری کوردیدا مەشقی خۆی دەکات. هێزیکی ترسناك بوونی هەیە و بەردەوام هەوڵدەدات ژیانی نووسەر بخاتە ژێر هەڕەشەوە، تیرۆری کەسایەتی بکات، گومان بخاتە سەر کاراکتەری و بەدوویەوە بێت لەهەڵەکانیدا وەك ئینسان، تانەی لێبدات و بژێوی و ژیانی بخاتە ژێر گوشارەوە. ئەم هێزە تاریکە دژە ئەدەبیە سالآنێکە لە شیرکۆدا ئەو فیگورە دەبینێت کە دەبێت لێیبدات، تەنانەت بەناوی شیعر و ڕەخنەی ئەدەبی و ئەدەبەوە لەدژی شێرکۆ لەکاردابوون. ئەم هێزە تاریکە دژە جوانیە لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەمامکدارە و تەنها لەوەدا کورتناکرێتەوە کە بەئاشکرا کاربکات، بەڵکو خۆی لەو نیمچە ڕۆشنبیر و لەتە ئەدیبانە دەبینێتەوە، کە بەدرێژایی مێژوی ژیانی ئەدەبی ئێمە، خۆیان بەدەسەلآتەکانەوە هەڵواسیوە و ئەوەندە نووسینیان هەیە کە بتوانن بەردەوامی بدەن بەناونیشانەکانی خۆیان و لەڤیستیڤاڵەکاندا پێی دەربکەون، لە کردەی داهێنانیشدا بچوك و زۆر بچوکتردەبنەوە. ئەم هێزە هەمان فۆرمی خێڵە، هەمان خەمی گردبونەوەی خێڵی هەیە، لەبەرئەوە دەرکەوتنی خۆی لە ڤیستڤاڵ و دیوەخانەکانی دەسەلآتدا زۆر لەلا گرنگترە وەك لە کردەی داهێنان. ئەم خێڵەکیەتە



ماسکداره لەم کەشە مۆدێرنە کەرنەڤاڵیەدا لەفیگوری ئەدیب، ماسکی شاعیر، ئەکادیمیست، چالاکەوان، سیاسی پۆست مۆدێرنیست و لیبرالدا خۆی نمایشدەکات. ئێمە دەکەوینە هەڵەیەکی گەورە وا مەزندە بکەین کە تەنها سەلەفیە توندڕەوەکان لە دژی شیرکۆ لەکاردا بوون، بەڵکو لەپشت ئەمانەوە سوپایەك لەو ماسکدارە هیلاکانە داینەمۆی ئەو هێزە بوون، کە لەدژی ئەو هێزە ئیستاتیکا گەورەیە لەکاردا بوون، ئەمانە لە دژی شێرکۆ بوون، چونکە بوونی شیرکۆ، بوونی شاعیرێك بوو لەجیهاندا. ئەم ماسکدارە نوێیە لەگەڵ کۆچی شێرکۆدا فرمێسکی درۆینەی ڕشت، بەڵام لەبنەڕەتدا لەدژی ئەوە بوو وەسێتنامە جوانەکەی جێبەجێبکرێت. ئەم هێزە خێڵەکیە دیوانخوازیە ماسك مۆدێرنە، دەیەوێت هەمیشە ئەو وێنەیە زەقبکاتەوە بەوەی شیعر کورتبکاتەوە بۆ سەر فیگوری شاعیر و چیرۆکنوسێك کە ناتوانێت دەستی لەسەری جیابکاتەوە، ئەم هێزە دەیویست بڵێت کە باوەڵە ئەبەدیەکەی شیرکۆ، باوەڵی پیاوێکە نازانێت چی لەدونیادا دەگوزەرێت، دەیانویست باوەڵەکەی پێ دابنێن و لەدیوەخانەکەیاندا داینیشێنن، بەڵام شیرکۆ تا کۆچی ئەو باوەڵەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و تائێستاش باوەڵەکەی درێژبونەوەیەکی ڕەمزی هەیە لەنێوماندا.



## چیرۆکی ئەم باوڵە تەنەکەیە

شیرکۆ بە باوەڵێکی قەدیمەوە، بێ شوێن و ڕێگە و جێگە و بێ هاودەم و هاورێ لەگەڵ هەژاریەکی ترسناکدا ڕووبەروو دەبێتەوە. لەدوای مردنی بێکەسی باوك و شووکردنەوەی دووهەمی دایکی و سەفەرکردنی بۆ بەغدا بەخۆی و کچەکانیەوە، شیرکۆی مێردمناڵ بەجێدەمێنێت!. شێرکۆی مێرد مناڵ، ڕازی نییە بچێت لەگەڵیاندا. لەیاداشتەکانی ئاوی خۆڵەمێشدا نووسیویەتی: من تەمەنم سیانزە چواردە ساڵان بوو، کە دایکم شووی بەعومەر هەڵمەت کردەوە. خەریکبوو شەشی سەرەتایی تەواو بکەم، بەڵام من ئەم شووکردنەوەیەی دایکم زۆر پێناخۆش بوو.. لەشوێنێکی دیکەدا نوسیویەتی: زۆرم لەگەڵدا خەریکبوون، باسی بەغدایان بۆ ئەکردم، بەڵام من وەك یاخیبوون، یاخیبووم و نەچووم. ئەم جیابوونەوەیە برینێکی قووڵ و بەسوێی کردە دڵمەوە و ڕۆژانی ئایندەمی لەبەرچاو ڕەشکردم! ئیتر دایکم و خوشکەکانم ڕوویانکردە ماڵی تازەی بەغدایان و منیش نائومێد و دڵشکاو، باوەڵە تەنەکەکەم خستە سەرشانم و ڕوومکردە ماڵی خاڵە عومەرم ل٦٨... ئاوەها شیرکۆ بێکەسی مێردمناڵ دەبینین تەنیایی خۆی لەگەڵ قەسیدەدا هەڵگرتووە، بەتەنیا لەسلێمانیدا وەك گەنجێك،



وەك مێردمنداڵێك كە سەری پڕێتی لە بیرۆكەی شیعر و خەون، هەتیو و تەنیا لەماڵە خزمانی گیرسایەوە، لەو بڕوایەدام لەو ساتەوە كە بێكەسی مێردمنداڵ باوەڵەكەی هەڵدەگرێت، لەوساتەوە تامردنی ئەو باوەڵە هاوسەفەری شێركۆ بووە. ڕاستە باوەڵەكە لەڕووی فیزیكیەوە وندەبێت، بەڵام وەك نەبینراوێك هەمیشە لەگەڵ شێركۆدا هاوسەفەر و هاوخەم و هاوشیعر بووە. فایەق بێكەسی شاعیر بەگەنجی لەتەمەنی چل و سێ ساڵیدا كۆچدەكات، بێكەس باس لەو بەیانیەی كۆچی باوكی دەكات و بەو دێڕە وەسفی دەكات ، بەوەی: هەرگیز ئەو بەیانیەم بیرناچیتەوە! ١٧. فایەق بێكەسی شاعیر لەو تەمەنە كورتەیدا شێركۆ و خوشكەكانی بۆ زەمەنێكی سەخت و ڕۆژگارێكی بێئامان جێدێڵێت. شێركۆ نووسیویەتی و دەڵێت: ئەو ڕۆژە شوومە ١٩٤٨/١٢/١٨ بوو، تەمەنم هەشت ساڵی پڕ نەكردبۆوە، لەپۆلی دووی سەرەتایی بووم. تا ئێستەش بەووردی دیمەنی ساتەوەختی ئەو مردنەی باوكم لەپێش چاوە. دایكم خەبەری كردمەوە... لەپڕ ئەو كۆكەیەم بیست و دایكم شڵەژاو پەلاماری باوكمیدا و ڕایوەشاند، هەر ئەو ساتە داوای لێكردم بچم بەشوێن كاك ئەحمەدی ئامۆزایدا... هەر ئەو ڕۆژەش هەستمكرد چەند ساڵێك گەورەتر بووم، وەك لەناخەوە هەڵتەكابم وابوو، تووشی ڕامانێكی قوڵی خەماوی بووم...ل١٨. ئاوەها لەهەندێك شوێنی خوێندنەوەی یادەوەریەكاندا من گریاوم، منێك كەهەرگیز نایەڵم هەستەكانم بگاتە ئاستی ڕۆمانسیەتێكی گەرم و مەشقی ئەقڵانی كانتی یان سڵۆتێردایكانە دەكەم بۆ زاڵبوون بەسەر سۆزداریدا، بەڵام بێ ویستی خۆم و زۆرجار چاوم پڕدەبوون لەفرمێسك، زۆر جاریش تووڕە دەبووم، زۆر جاریش دەمگووت: بۆ، ئاخر مامۆستا بۆ؟! من لەدوای تەواوكردنی ئەم دووكتێبەی مامۆستا شێركۆ ، كە بەچەند ڕۆژێك و بەخێرایی خوێندمەوە، بیرم لەوە دەكردەوە بچم بۆ سەردەم و لەسەر شێوازی نوسینەكەی قسەی لەگەڵدا بكەم، كەچی كە بیرم دەهاتەوە مامۆستا شێركۆ ڕۆیشتووە و ئێستا ناتوانم ڕەخنەی لێ بگرم و بڵێم: دەكرا بەشێوەیەكی دیكە ئەم بیۆگرافیایەت بنوسیایە! حەتمەن وەك پیشەی خۆی ڕاكەی منی بەجیدی وەردەگرت و بەبێدەنگی گوێی لێدەگرتم! بەڵام ئەمە مەحاڵە چونكە شێركۆ ئێمەی بەجێهێشت، بەڵام باوەڵە تەنەكەكەی بە نەبینراوی بۆ ئێمە جێهێشت.

## باوەڵەکەی شیرکۆ، باوەڵەکەی نەجمەدەینی مەلا و گۆران

لێرەوە مەزندەی ئەوە دەکەم کە ئەدەبی کوردی لەم باوەڵە تەنەکە هەژارەی خۆیدا خەسڵەتەکانی خۆی پاراستووە، یەکەمیان لەدژی دەسەڵاتی بێگانە کە لە نالی گەورەوە درێژدەبێتەوە تا ئەمڕۆ. دووهەمیان لە دژی هەموو ئەو هێزە گەورەیەی دژی ئیستیاتیکا و ڕۆحی شیعر کاری خۆیدەکات. ئەو هێزە دواکەتووەی ڕقی لە ئەدەب و هونەری بالآیە و بەکاری شێت و نابووت و سەرلێشواوەکانی دەزانێت. ئەم هێزە تاریکە کە تائێستا لەفۆرمدا گۆڕاوە دەنا لەجەوهەردا وەك خۆی ماوەتەوە، هێزێکە هەمیشە هەوڵیداوە باوەڵە تایبەتەکە لەشاعیر و ڕۆحی شیعر و چیرۆکنووسین بسەنێتەوە، هەمیشە هەوڵیداوە باوەڵەکەی پێدانێت و لەخانە بەندیەکانی دیوەخانی سیاسی و کاری دیکەدا قەتیسی بکات. بەڵام ئەم باوەڵە پڕە لەتەنیایی و چیرۆك و شیعر، باوەڵێکە کێشە وجودیەکانی سوبێکتی ئەدەبی و ڕۆحی شیعر و ئایدیاکان لەدرەوەی جەوقە موزیکیە نەشازەکە هەڵدەگرێت و سەرقاڵە بەخۆیەوە. هەر یەك لەئێمە لەباوەڵە تەنەکەکەی خۆیەوە لەگەڵ جیهاندا قسە دەکات و سەرقاڵە بەکاری خۆیەوە، لێرەوە دەتوانم بڵێم کەئەم باوەڵە تەنکەیە ئەو دووریە ڕەمزیە گەورەیەیە، کە لە شێرکۆوە بە میراتی بۆمان ماوەتەوە.

ئەم باوەڵە قەدیمە باوەڵەکەی نەجمەدینی مەلایە، کە دەمرێت چەند کەسێکی کەم بەدووی تەرمەکەیەوە دەبن، شاعیریك، خەمخۆرێك بۆ کوولتور لە تەنیایی خۆیدا و لەگەڵ باوەڵەکەیدا دەمرێت، کە تاکە قاسەیە لە کەشتیەکەی ئەودا. باوەڵێك فێرکردنی زمانی کوردی و شیعر و خۆشەویستی مرۆڤ و ئاژەڵانی لەنێودا بوو. دەڵێن کە نەجمەدینی مەلا دەمرێت چەند منداڵێکی ڕەش و ڕووت و هەژارێك بەدووی تەرمەکەیەوە دەبن. بەمەرجێك کە تەرمی فەرمانبەرێکی گەورەی کورد لەبەغداوە دێتەوە، هەموو سلێمانی پێشوازی لێدەکەن. تەرمی پیاوێك لەتەنیشت مەلیك فەیسەڵەوە و لەدیوەخانەکاندا خۆی وەك شاعیر و مێژونوس ناساندووە، ئەم دوو وێنەیە لەزەمەنێکی کورتدا بەدووی یەکدا دێن.

ئاوەها ئەم هێزە تاریکە هەوڵدەدات باوەڵەکە لەدەستی گۆرانی شاعیر بفرێنێت، دەیەوێت شاعیرێکی گەورەی وەك گۆران بچوك بکاتەوە بۆ سەر ڕووداوێکی بچوك لەژیانیدا و بەمەش باوەڵەکەی تەسلیم بەئەوان بکات. بۆ نموونە چیرۆکی کورتهێنانێك لە خەزێنەی فەرمانگەکەی و بەندکردنی گۆران لەسەر ئەو کورتهێنانە بەردەوام تائەمڕۆ





دووبارە دەکەنەوە. بەڵام ئەو شۆڕشە گەورە زمانەوانیە نابینن، ئەوە نابینن گۆران لەپێچێکیدا کلاسیك بەجێدەهێڵیت ودونیایەك موزیکی تازە، هەناسەی نوێ و وێنەی مرۆڤی خەیاڵبۆکراوی نوێ دەهێنێتە زمانەوە. زمان لەسەر ئاستە کلاستە پاشکۆیەتیە عەرەبیەکەیەوە دەبێتە زمانێك کە هەناسەی کوردی و موزیکالیەتی نوێ نمایشدەکات، زمانی کوردی لەگۆرانەوە هەناسەیەکی نوی وەردەگرێت و بانگەشەی خەونێکی نوێی کوردی دەکات. لەباوەڵە تەنهاکەی گۆرانەوە مرۆڤیکی نوێی کوردی ئازاد بوو لەدواکەتوویی کۆمەڵایەتی بەخۆی و خەونەکانیەوە خۆی نمایشدەکات. گۆران هەرچەندە لە بەندیخانەکاندا و لە قاوشی خەستەخانەکاندا لەژێر زۆرداری ژیان و دیکتاتۆر و زەمی هاورێکانیدا ژیانی بەسەربرد، کەچی لە باوەڵە تەنەکە و تەنهاکەیدا دونیایەکی دیکەی پڕ ڕۆحی شیعری بوونی هەبووە. ئەم هێزە دژە ئەدەبیە ئەوەندە ناشرینە تائێستاش لەوە ناوەستێت هەڵەیەك لەژیانی گۆران باس نەکات، بەمەرجێك دادگا لەیەکەم دانیشتندا بڕیاڕی ئازادکردنی گۆران دەدات لەبەرئەوەی ئەو هەڵەیە پەیوەندی بەئەوەوە نەبووە و کەمکردنی پارە لە قاسەی خەزێنەکە هەڵەیەکی ژمێریاریە. هەرچەندە کەسانێکی دڵسۆز بەگۆران دەڵێن ئەوان دەتوانن پارەکە بدەنەوە لەجیاتی ئەو و کێشەکە کۆتایی پێدێت، بەڵام گۆران ڕازی نابێت بەوە، چونکە دەزانێت کە تاوانبار نییە. سەیر لەوەدایە لە تانە لێدانەوەی بڕیاڕی ئازادکردنی گۆرانی شاعیر، ئەم شاعیرەمان بەندکردنی بەسەردا دەسەپێنرێت. تائێستاش ئەو هێزە ناشرینەی لەبۆسەدایە بۆ گۆران، بەسەر هەموو جوانیەکانی گۆراندا بازهەڵدەدا وباسی (بەندکردنی گۆران دەکات لەسەر دزی) و دەیەوێت وێنەی گۆران بشێوێنێت. تەنانەت ئەم هێزە تاریکە چەقۆکێشەکانی سلێمانی دەنێرن بۆ گۆران بۆئەوەی سوکایەتی پێبکەن و لەچایخانەیەکدا تفی لێدەکەن. نەك هەر ئەوە بەڵکو کاتێك گۆران بەخۆی و باوەڵە تەنەکە تەنهاکەیەوە دەچێتە مۆسکۆ بۆ چارەسەر، داوا لە حزبەکەی دەکات کە بڕێك زیاتر لە مۆسکۆ بمێنێتەوە، کەچی لەلایەن هاورێ شیوعیەکانیەوە ئەو داوایەی ڕەتدەکرێتەوە!. بێگۆمان بۆ یەکێکی وەك گۆران مۆسکۆ بەشێك بووە لەو هێورییەی کە جەستەی نەخۆشی و ڕۆحی شیعری پێویستی بووە، لای گۆران مۆسکۆ وڵاتی پۆشکین و دێستۆیڤسکی و چیخەف و تۆلستۆی بووە. نەك هەر ئەوە بەڵکو لەبەغدا هەموویان سەردانی گۆران دەکەن و دەبینن ژوورەکەی چەندە هەژارانە و ڕووتە لەمۆبێل، هەموویان لە یادەوەریەکاندا باسی ئەو هەژاریە دەکەن، بەڵام خۆیان لەوە دەدزنەوە، کە قەرزاریان بۆ کوولتور

و خەباتی بۆ ئازادی ئەو ئەرکەی دەخستە سەرشانیان، کە نەدەبوایە گۆران ئاوەها بژیایە. گۆران تامردنی باوەڵەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و تەسلیمی هیچ هێزیکی دیکەی نەکرد لە دونیادا، جگە لە هێزی شیعر نەبێت. بەمشێوەیە لە کۆنەوە تائێستا ئاوەها ئەم هێزە تاریکە لەدژی ئەدەب کاردەکات، لەبۆسەدایە بۆ شاعیر، ئیدی کە ڕۆحی شیعری دەڕوخێت، کە دەکەوێتە چاڵە ڕەشەکانی سیاسەتی باو یان وشکدەکات، ئەم هێزە بەختەوەرە و سەمادەکات، بەڵام کە بەردەوام باوەڵەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و سنورەکان دەبڕێت و لەم شار بۆ ئەو شار و لەم سنور بۆ ئەویدیکە ڕۆحی شیعر لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت، ئیدی ئەم هێزە غەمبار وتوڕەیە و بەزەرەبین چاوەڕێی ژماردنی یەك دێرە، کە چەند مانایەك هەڵبگرێت، یاخود ئەم شاعیرە لەسنووری مرۆڤبوون دەردەکات کە نشێو و سەرکەوتنی هەیە، هەڵەی هەیە وەك هەموو مرۆڤێك. لایەنگری سیاسی و لێکدانەوەی هەڵە و دڵداری و ژیانی تایبەتی خۆی هەیە، نەخێر ئەم هێزە بەناوی پێرفێکتیەوە، بەناوی بەها ئەخلاقی و شۆڕشگێڕیەکانەوە پەلاماری شاعیر دەدات و لەهەموو وێستگەیەکدا دەیەوێت باوەڵەکەی دابنێت و لەگەڵیاندا دانیشێت و تەسلیمی ئەوان بێت.

### لەجیاتی هێمنی فەوزای شەڕەئاو

ڕۆژێك پێش هاتنەوەی تەرمی شێرکۆ لە شاری سلێمانیدا بەپێی قسەی ڕێکخەرانی میهرەجانی شەڕە ئاو، سەد هەزار کەس لە پارکی ئازادی شەڕە ئاو وشەڕە قوڕدەکەن. لە ڕۆژی دووهەمدا بەنیوەی ئەم ژمارەیە لەپێشوازی تەرمی شیرکۆدا ئامادەنابن! ئەم میهرەجانە بەناوی بەختەوەری و کرانەوە لەسەر شاردنەوەی غەمباریمان بە کۆچی شیرکۆ ئەنجامدرا، ئەم میهرەجانە لەدژی ئەو هێمنیەبوو کە دەبوایە وەك ڕێزیك بۆ شێرکۆ لەو ڕۆژانەدا پارێزگاری لێبکرایە، چونکە مەرگی شاعیرێك تاقانەیە و یەکجار ڕوودەدات، بەڵام شەڕە ئاوەکان نەك ڕۆژ بەڵکو چەندەها ساڵیان لەبەردەمدایە بۆ دووبارەکردنەوە. سەیر لەوەدایە مەرگی ئەم شاعیرەمان کە شیعری بۆ هەموو کۆڵانێکی ئەم شارە گوتووە نابێتە هۆی دواخستنی تەنانەت هەفتەیەك یان چەند ڕۆژێکی ئەم میهرەجانە، ئەو هێمنیە باڵاو ترانسێندێنتاڵەی هاتنەوەی شیرکۆ پێویستی پێ بوو، لەقوڕولیتەی پارکی ئازادیدا خنکێنرا. شیرکۆ شیعری بۆ هەموان نووسیوە، بۆ ئەو منداڵانەی چوارباخ کە لەماشێنێکی بەندیخانەدا بەزیندوویی بەعس سوتاندنی، شیعری بۆ دەرگەزێن، پیرەسوور، مەڵکەندی و کۆترەکانی کاکە ئەحمەدی شێخ و کانێسکان. شێرکۆ گۆرانی



بۆ مێژووی ئەمشارە گوتووە، هەڵقونەی کەوێك نییە، جریوەی چۆلەکەیەك نییە، خوڕەی ئاوی جۆگەیەك نییە لەکوردستاندا دێڕێکی شیرکۆمان بیرنەهێنێتەوە. سمکۆڵانی ئەسپە شێیەك نییە، بەردێك نییە کۆپلەیەکی شێرکۆی لەبندا پاڵ نەکەوتبێت، شەقامێك نییە قەسیدەیەکی شیرکۆی پێدا تێپەڕنەبوو بێت، دونیایەکی کوردی نییە شیرکۆ شیعری بۆ نەگووتبێ. کەچی کە تەرمەکەی لە هەولێر دادەبەزێت، ژمارەیەکی کەم پێشوازی لەتەرمەکەی دەکەن، دەبوایە حکومەت و دونیا لەو ڕۆژەدا بۆ ڕێز لە وشەی نووسراو و شیعر سڕومات بوونایە. کە دێتەوە بۆ سلێمانی جگە لەچەند هەزارێك نەبێت، لەوانەشە کەمتر، لەپێشوازی ئەودان. پێش هاتنەوەی تەرمەکەی دونیایەك مەلای سەلەفی لەدژی ناشتی لەتەنیشت مۆنمێنتی شەهیدانی حوزەیران فەتوایاندا، فەتوای نەناشتنیاندا، چونکە شیرکۆ خودای لەچاوی منداڵە بۆیاخچییەکەوە بینیوە، نەك لەچاوی سەلەفیەکان. ئەم فەتوایە لەڕاستیدا فەتوای دەرکردنی لاشەی ئەو بوو لە نیشتمان، فەتوای ناشرینکردنی هێزی شیعر بوو، فەتوایەك بوو لە دژی باوەڵە تەنەکەکەی شیرکۆ، کە بەدرێژایی تەمەنی وەك گۆران نەیدا بەهیچ هێزێکی ئەم دونیایە. شیرکۆ دۆڵابەکەی بۆ خودا نەکردەوە، بەڵکو بۆ منداڵێکی بۆیاخچی کردەوە و لەگەڵیدا بەپێکەنینەوە بیریان لە پێڵاوەکانی خودا دەکردەوە، چۆن ئاوەها بەسەرسەری مرۆڤەوە ئامادەیە و دونیای پڕکردووە لە جەنگ و کوشتار. ئەم هێزە سەلەفیە لەلایەك و لەلایەکی دیکەوە هێزیکی کرچ و کاڵ و ڕووکەش و بازاڕیی، بەناوی ئازادی و کرانەوە بەسەر چێژخۆریەکانی مۆدێرنەدا، ئامادەنەبوو شەڕە ئاوەکەی دوابخات. ڕۆژێك پێش هاتنەوەی تەرمی شێرکۆ لە شوێنی شەهیدانی حوزەیران شەڕە ئاو و گاڵتەبازاڕی منداڵانە و موهەڕیجی نوێی پۆست مۆدێرن سەمای بەختەوەری خۆیان دەکرد. هەر لەو ڕۆژەشدا گۆڕی شیرکۆ بۆ ناشتنی ئامادە دەکرا! لەو ڕۆژەدا ئەوە ڕوویدا، وەك ئەوەی هەموویان بەمردنی ئەم شاعیرەمان بەختەوەربن، وەك ئەوەی هیچ حورمەتێك بۆ مردنی شاعیرێك لەم دەڤەرەدا نەمابێت، ئاوەها مەرگی دەکرێت بەمەهزەلەی شەڕە ئاو، یان فەتوای مەلا سەلەفیەکان. لەو ڕۆژەدا هەردووکیان، کەڕناڤاڵخوازە مۆدێرنەکان و سەلەفیەکان لە تیرۆرێکی دیکەی ڕەمزیی شێرکۆدا یەکیانگرتەوە. ئەم مێگەلە جەماوەریە لە جەوهەردا هەمان مێگەل بوون لە دژی گۆران، لە دژی نەجمەدینی مەلا و نالی و مەولانا خالید



و جەمال عیرفان لە کاردابوون، ئەمجارەیان بەناویی کرانەوەی نێر و مێ و میهرەجانی شەڕە ئاو تیرۆری غەمباری ئێمەیان کرد. ڕۆژی دوایی بەنیوەی ئەوانەی لە شەڕە ئاوەکەدا بوون نەهاتن بۆ پێشوازی لە تەرمی شێرکۆ! ئەمە جگە لەوەی پارکی ئازادی لە فەوزا و پیسی و قوڕی ڕۆژی یەکەمدا نقومبوو، ئەمە زیاتر کەش و هەوای ناشتنی تەرمی شێرکۆی قورستر کرد.

لەدوا جاردا دەمەوێت بڵێم: لە ئەدەبی ڕووسیدا نۆڤڵێتی "پاڵتۆ"ی گۆگۆڵ ڕەمزی ئەدەبێکە کە ئازاری گەورەی چەوساندنەوەی مرۆڤی ڕووسی بەرجەستە دەکات، ئاکایی ئاکاییسڤیچ پاڵەوانی ئەو ڕۆمانەیە و ڕەمزی ئەو فەرمانبەرە دڵسۆزەیە، کە نە بەرتیلخۆرە، نەدزە و نەدەشتوانێت گەندەڵ بێت. بەهیلاکی چەند ساڵێک پاڵتۆیەک دەکڕێت و لەدوایشدا و لەیەکەم شەوی تۆفاندا دز و جەردە ڕووتیدەکەنەوە. ئاکایی ئاکاییسڤیچ بەخەفەتی پاڵتۆکەیەوە دەمرێت، بەڵام دوای مردنی دەبێتە خێوێک دەچێتە سەر ڕێگای پاڵتۆ دزەکانی کۆمەڵگەی ڕووسی. ڕۆمانوسی ڕووسی دۆستۆیفسکی دەربارەی ئەم نۆڤڵەی گۆگۆڵ دەڵێت: ئێمە هەموان لە پاڵتۆکەی گۆگۆڵەوە هاتووین... بەمەش گۆگۆڵ دەبێتە قوتابخانەیەک بۆ نەوەیەکی دیکەی ئەدەبی ڕووسی. لەبەرئەوە مافی خۆمانە لەبەرامبەر گەورەیی شێرکۆ و ژیانیدا بڵێین: ئێمەش هەمومان لەباوەڵە تەنەکەکەی شێرکۆوە هاتووین، تائەبەد لەباوەڵەکەی دەڕوانین..



سەرچاوە: شیرکۆ بێکەس: نوسین بەئاوی خۆڵەمێش ، بەرگی یەکەم، چاپی غەزەلنوس ٢٠١٣



# شێرکۆ بێکەس دوا شاعیری مولتەزیم

**ئەحمەدی مەلا**

ماڵئاوایی شاعیر هەرگیز یەکجارەکی نییە، ماڵئاواییمان لێ دەکات و لەگەڵیشمان دەمێنێتەوە. ئەمە جاویدانیی وشەیە، ناوەڕۆك و رۆحی ئینسانە. شیعر بەم دووە لەسەر پێی خۆی دەوەستێ. وشە و رۆح : جمکانەی ئەبەدی.

شێرکۆ بێکەس خەونبین بوو و واقعیانەش شیعری دەنووسی. واقیع لە شیعری ئەودا فرە رەهەندە: سیاسەت قووڵاییەکەیەتی و چەمکە کۆمەڵایەتییەکانیش لە خزمەتی ئەودا لە کارن. فەزا تێکچڕژاوە. ئایدیال لە شیعری ئەودا لە واقیعەوە سەرهەڵدەدەن و لە سەرچاوەی ئەو توێشوو وەردەگرن، لە ئەودا گەورە دەبن و لە ئەویشدا پەرە دەسێنن. کەس هەندەی بێکەس لە شیعردا وابەستەی واقیعی کوردستان نەبووە. وشە لای ئەو دەبێ بە فلتەری واقیعدا تێپەڕێ بۆ ئەوەی تێکهەڵکێشی خەونەکانی بێ. خەونە مەزنەکەی شاعیریش کوردستانە.

ئەم واقیعەش لە گۆڕاندایە، لە شەستەکانی سەدەی رابردووەوە و تا دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکەم، نەخشەی سیاسی بە چەندین جۆر گۆڕانکاری بەسەر دێت، شۆڕش و نسکۆ و سەرهەڵدانەوە و راگواستن و ئەنفال و تاراوگە و دوا شەڕی کەنداو و گەڕانەوە و بەرجەستەبوونی بەشێك لە خەونەکانی شاعیر. ئەگەر بە وردی دەقە شیعرییەکانی شاعیر بەسەر بکەینەوە، ئەوە وەك ئەوە وایە کە بەرامبەر بە رۆژمێرێك راوەستابێتین، واقیع لە جووڵە دایە و رۆحیش هەناسە دەدات، رەنگدانەوەی جیهانێکە لە هەڵکشان و داکشاندایە.

بە ناو قەبرغەی ئەم دەقانە هێڵێکی فیکریی لە گەشەسەندندایە. ئەویش گەیشتنە بە زمانی "چیا" و دامەزراندی "هەوارگەی" کوردان. لەم هێڵە زەمەنییەدا، هەڵبەتە زمان رۆڵی یەکەم دەبینێ بۆ ئەوەی بەشداربێ لە دروستکردنی "دروستکردن"بدات. دامەزراندنی شوێن و زمان وەکو پرۆژەیەکی شیعری ـ واقیعی لە لای شێرکۆ بێکەس بەرجەستە دەبێ.

شوێن: کوردستانێکی سەربەخۆ بێت و زمانیش وەکو بڕبڕەی پشتی ئەو هەیکەلە بتخاتە جووڵە و رۆحی بداتێ. هەر لە تریفەی هەڵبەستەوە تا دوا دیوانەکانی، دەتوانین بڵێین پرۆژەی شیعریی شێرکۆ بێکەس بە دەوری ئەم تەوەرەدا خول دەخوات. ئەم خولبەستنەیە کە هێزێکی ئەفسانەیی و رۆحێکی پیرۆز دەخشێتە دەقەکانی شیرکۆ بێکەس. ئەفسانە وەکو گوتاری یەکەم، وەکو گوتاری بنیاتنەر ئەم هەوڵە دەگرێتە ئەستۆ و چیا وەکو پێگە دەبێتە مۆڵگەی زمانێك کە هێزیکی پیرۆز لە ناوەوە دەیجولێنێ. لە سەرەتای نووسین ئەم دیدە لە لای شاعیر نەخەملاوە، بەڵام هەموو ئاماژە و هێماکان بەو ئاراستەیە وەردەچەرخێن؛ قۆناغ دوای قۆناغ ئەم دیدە شیکل و فۆرم وەردەگرێت. چیا لە شیعری شیرکۆ بێکەس دەیەوێ جێگای کەعبەی موسڵمانان بگرێتەوە. چیا وەکو هەرەمێك بنەکەیەکی پتەوەی هەیە و ترۆپکی چیاش ئاراستەی ئاسمانێکی پان و بەرین دەکرێت. لوتکە دونیای باڵا و دونیای خوارەوە پێکەوە دەبەستێتەوە.

لە زۆربەی شارستانییەتەکاندا، ئەفسانەی بنیاتنەر وەکو هێزێکی بزوێنەر دێت و مێژوو دەخاتە جوولەوە. لە نادیارێکەوە سەر هەڵدەدا، دەیەوێ بەرە و "دیار"ێك هەنگاو بنێ. شیعری شێرکۆ بێکەس هەڵگری ئەم دەلالاتەیە. تەنانەی لە سەر ئەم دەلالاتە خۆی رێکخستووە.



زمان وەکو دەلیلێك خۆیمان پێ دەناسێنێ. دیوان نییە لە لای شێرکۆ بێکەس لە کۆتاییەکەیدا، فەرهەنگۆکەیەکی نەبێ مانا و ئاماژەی موفرەدەکانمان بۆ شیتەڵ و راڤە نەکردبێ. لای ئەو زمان لە دوو رەهەنددا لە ئێشکردندایە. زمانی شیعری و زمان وەکو رۆحی نەتەوە. زمانی شیعریی لە خزمەتی نەتەوەدایە و زمانی نەتەوەش دەچەمێنێتەوە ئاستی زمانی شیعریی.

لە ئاستی زمانی نەتەوەییدا، شێرکۆ بێکەس شارەزاییەکی تەواوی هەیە لە جوگرافیای کوردستان: بنچکە گیایەك، قوتەی شاخێك، جۆگەلە و زرێبارێك، ئەشکەوت و هەڵەتێك، گەوەیەك و دۆڵێك دەبنە هەوارگەی جوگرافیای زیندەوەران، قاسپەی کەوێ، هەڵفڕینی سوێسکەیەك، بنچە توترکێ، پیرە داربەڕوویەك، لاسکە گیایەك، کوڕکوڕێکی گەرمیانی، هەڵۆی زۆزان و رەشماڵێکی رەوەندان و پەڵەهەورێکی گەڕۆك دونیایەك پێکدەهێنن پاراو، وەکو بڵێی دونیا لە قۆناغی سەرهەڵدانی بێت. گوێمان لە زریکەی پەلەوەرێکە، غەمی ئاسکێکی بەجێماو، کڵۆ بەفرێك خەریکە دەتوێتەوە، دەنگێ با و زریان تێکەڵی ئاسمانی سەرشێت و باراناوی دەبێ. پەڵکەزێڕینە و زەردەپەڕ و کازێو و بۆنی خۆڵ و تەپوتۆز و شێی دۆڵ و هێشکایی گەرمیان، رەنگی کۆڵان و کورسی چایخەنەکان، بچووکترین جووڵە و گرمەی هەور و هاژەی رەشەبا دیمەنە شیعرییەکانی شاعیر پێکدەهێنن. لەم رووەوە زمانی شیعریی شێرکۆ بێکەس فەرهەنگێکیشە بۆ زمانی نەتەوە.

لە ئاستی زمانی شیعریشدا، پانتاییەکی فراوان داگیر دەکات. شیکلی شیعری گۆران دەقۆزێتەوە و ئیشی لەسەر دەکات. شیعری ئازاد تا دوا تخووبەکانی پەخشانە شیعر دەبات. ناو لە فۆرمی نوێ دەنێت، هەمیشە و بێ وچان خەریکی نووسینەوەی دەقی نوێیە. لەو نێوەندە سەروا و دەنگ و کێش و گەمە شیکلییەکان تا ئەو رادەیە بەکاردەهێنێت کە سەلیقەی شیعریی بەسەریدا زاڵە.

"کوردستان لە شیعری من دەرهێنی هیچ نامێنێتەوە" ئەمە بوو پەیامی شیعریی لە لای شیرکۆ بێکەس. دەیویست دونیا تا ئاستی کوردستان بچەمێنێتەوە. لە دوورترین شوێن زوڵمێك لە کورد کرابێت، ئەو بە شیعر قسەی لێکردووە. دەکرێ بوترێت شێرکۆ بێکەس پەیامبەری شیعری نەتەوایەتییە.

لە دەقی شیعری "کورسی" دەبینی کە ئیدی "ئازادی" لە کوردستان لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتووە و وەکو بڵێی خەونی شاعیر هاتبێتە دی. بەڵام ئەو باش دەیزانی کە دوا قۆناغ، سەربەخۆیی کوردستانە. ئەم سەربەخۆییە وەکو پەنگرێك لە نێو هەلومەرج





و دێوەزمەی جیۆپۆلتیک زۆر بە زەحمەت دەکرا لە خەونەوە بگوازرێتەوە بۆ واقیع.
لەم سۆنگەیەوە شیعری شێرکۆ بێکەس، ناسنامەی میللەتێکە لە نێوان بەرداشی جوگرافیا و مێژوو لە خودی خۆی دەگەڕێ، پسوولەیەکە بۆ ئەوەی لەم جیهانە جەنجاڵە بڵێ "منیش هەم" واتە "ئێمەش هەین". شیعر وەکو ئۆنتۆلۆژیا مۆرکی تاکەکەس و مۆرکی نەتەوە لە یەک مارە دەکات. لای شێرکۆ بێکەس "تاک" هەمیشە گرێدراوی "کۆ"یە. گەڕانێکە لە پێناو دۆزینەوەی ئەو جومگانەی کە "تاک" بە "کۆ" گرێ دەدات و یەک بە ئەوەی دیکە خۆی دەناسێتەوە. ئەم ئیلتیزامەیە کە شاعیر پێی وێڵە و عەوداڵێتی. ئەم چەمکە لە شەست و حەفتاکان لە ئەوجی بوو ؛ لە لایەک تیۆرییەکانی سارتەر ئیشی لەسەر دەکرد و لە لایەکی دیکەش شیعری بەرگریی فەلەستینی بە دەستی دەروێش و سەمیح قاسم لە ڕێگای شیعر و زمانەوە بەرگرییان لە مەسەلەی فەلەستینی دەکرد، دوو ئاستی دیار بوون لە نەخشەی کەلتووری شیعریی کوردیدا. شیعری مولتەزیم ئەو دەقەیە خاوەن دوو ئاراستەیە، ئاراستەیەکی لە نێو پێگەی میللەتدا ئیش دەکات، ئاراستەکەی دیکەشی دەیەوێ جیهان بشعرێنێ.
ماڵئاواییکردنی شاعیر ماڵئاوییەکیشە لەو تەمەنەتێکی شیعریی کە لە دوای ڕاپەڕینەوە هێدی هێدی خۆری بەرە و ئاوابوون دەچێت. جێگا بۆ شیعرێک خۆش دەکات کە "تاک" دەیەوێ لە ڕێگای شیعرەوە خۆی بە دونیا بناسێنێ. لە هەموو بارێکدا شیعر و مێژوو دوو دەستەخوشکی ناکۆکن و نە پێکەوە هەڵدەکەن نە بە بێ یەکتریش دەژین.
شێرکۆ بێکەس جیهانێکی شیعرییە کە مۆرکی قۆناغێکی زۆر هەستیار و ناسک لە مێژووی کورد پێکدەهێنێت. ڕەنگە شێرکۆ بێکەس و فیکتۆر هیگۆی فەرەنسی هەندەی یەک وابەستەی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتووری نەتەوەکەیان بووبێتن. هیگۆ و سەدەی نۆزدەمی فەرەنسی لە یەک جودا ناکرێتەوە، وەک چۆن شیرکۆ و بێکەس و ئیلتیزامبوونی بە کوردستان جودا ناکرێتەوە. شێرکۆ بێکەس ماڵئاوایی لە قۆناغێک، لە تەمەنێکی شیعرنووسین دەکات و کلیلەکانی دەبەخشییە زمانێک کە ئیدی تاکی کوردی دەتوانێ هەموو گەمە شیعرییەکانی خۆی لە سەر تاقی بکاتەوە.



# کولتووری ڕەنگاوڕەنگی جیهانی شیعری شێرکۆ بێکەس پێویستی بەوەیە بایەخ و گرنگییەکی تایبەتی پێبدرێت

**هاشم سەراج**

بەداخەوە مەرگ مەودای نەداو لەپڕێکا داهێنەرێکی پڕبەخششی شیعری کردە ئامانج ،ئەوەی ڕاستی بێت لێدوان لەبارەی ئەزموونی شیعری شاعیری داهێنەری کورد شێرکۆ بێکەس کارێکی ئاسان نییە، چونکە لە دەسپێکی نووسینییەوە تا دواچرکەی گیانەلا، بەعیشق و حەز وخەیاڵ وخولیا و شەیداییەکی لە ڕادەبەدەر تێکەڵ بە سیستەمی زمان وجیهانی بێسنووری شیعرببوو ،لەبەرئەمەشە دەقەکانی شێرکۆ بێکەس سەرەڕای ئەوەی هەڵگری پرس و شوناسی نەتەوەین، لەهەمانکاتدا لێوانلیون لە تێمەی جۆراوجۆرو هەستی ئێستەتیکی، خەیاڵ، موزیك، وێنە، ئەڤین، هزر، پرس و بابەتی جۆراوجۆری ئینسانی، ڕاستە لەبارەی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس زۆرترین لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و فیکری ئەنجامدراوە، بەڵام دەشێ بەڕێکەوت ڕەخنەکارێکی بیرمەند هەڵبکەوێت و بەپێی قۆناغی یەك لە دوای یەکی ئەزموونی شیعری و لەڕێگەی پراکتیزەکردنی میتۆدەکانی ڕەخنەی نوێوە بەشێوازێکی جیاواز کار لەسەر شیعرەکانی بکات و ماسکە زمانییەکان هەڵبوەشێنێتەوە و دەلالەتە زەینییەکان بدۆزێتەوە و واتا نەگوتراوەکان بدوێنێت، چونکە کولتووری ڕەنگاوڕەنگی جیهانی شیعری شێرکۆ بێکەس پێویستی بەوەیە بایەخ و گرنگییەکی



تایبەتی پێبدریت، بۆ ئەوەی نەوەی ئێستا و نەوەی داهاتوو سوود و چێژی لێ وەربگرن، هەروەها سەرجەم دیمانەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆبکرێنەوە و کۆڕە شیعرییەکانیشی بەڕێك وپێکی ئەرشیفبکرێن، من لەم نووسینە چەند دێڕییەدا ڕێگە بەخۆم نادەم لەدەقە شیعرییەکانی بدوێم تەنیا ئەوە دەڵێم لە بواری شیعردا خاوەنی فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی زمانییە چونکە بەعیشقەوە مامەڵەی لەگەڵ تاقە وشەی جۆراوجۆری سەرجەم زارەکانی زمانی کوردی کردووە و توانیویەتی خودی ئەم تاقە و شانە بەسرووتێکی تایبەتی لەسیاقی ڕستە و دەستەواژەگەلێکی بێئەژماری تۆکمە و لەنجەداردا ڕووەو پۆیەتیکا و دنیابینی و ئەتمۆسفێریکی ڕیتمئامێزی ئێستەتیکی بەرێت و دەلالەتی فرەچەشنیان پێببەخشێت، هەروەها بەڕای من ئەزموونی ناوازەی شێرکۆ بێکەس لەبواری شیعردا، لەدوای هەوڵە نوێکانی هەریەك لە گۆران و شێخ نوری شێخ ساڵح، بە وێستگەیەکی پرشنگداری تایبەتی شیعری نوێخوازی کوردی دادەنرێت، دیارە لەبەرئەممەشە لەنێوەندی ئەدەبی کوردیدا تائێستا چەندین شاعیری بە ئەزموون هەن هەمان ڕەوت و ڕێچکە و ستایلی شیعری شێرکۆبێکەس پەیرەودەکەن بەڵام بەتۆزقاڵێك گۆڕانکارییەوە!

شێرکۆ بێکەس

**10/4/1996**

براو هاوڕێی

خۆشەویستم

کاکە بێگەرد



ئەم کاتەتان باش و بە هیوای خۆشیتانم. سڵاو و ڕێزم هەیە بۆ یەکەیەکەی خاووخێزان. نامەکەی دواییتان گەیشت. ئەویش هەروەکوو نامەکانی ترت تام و چێژی تایبەتی خۆیان هەبوو. من هەمووو نامەیەکی تۆ دوو سێ جارێك ئەخوێنمەوە چونکە هەست ئەکەم – لە دڵەوە بۆ دڵ نووسراوە- هەست ئەکەم تۆیش هەر تەنیابیت و ئەتەوێ لە دەرفەتێکدا بۆ نزیکترین کەس هەرچی گێژەڵوکەیەکی ناو دەروونت هەیە بەرەڵلای کەیت! چی بکەین! کەوتووینەتە سەردەمێکی ئێجگار ناقولاّ و تاریکەوە... پێم خۆش بوو کە نووسیبووتان چەند چیرۆکێکی تازەتان هەیە یەکێکیشیانت زۆر بە دڵە! "چاکە ئێمەومانان مەگەر لە ڕێگەی ئەو هۆنراوە خەم و خەفەتی خۆمان بە با بدەین" ئەوەی ڕاستیش بێ منیش ئەوە دە مانگە زیاتر لەگەڵ کارێکی شیعری گەورەدا خەریکم... بە هیوام هەژاندنی گەورەی لە دوابێ جارێ باسی ناکەم چونکە تەواو نەبووە... بەڵام زۆریم بڕیوە و کەمیم ماوە... من ئەگەر بە بەرهەمی تازەوە سەر نەدەمەوە... نایەمەوە... من ئیتر کە ئەم نامەیت بۆ ئەنووسم (الاغواء الاخیر للمسیح)ی کازانزاکیم بە دەستەوەیە... دیستانەوە وەکوو زۆر کاری تری هەرپێغەمبەرانە ئەنووسێت!

لەم ڕۆژانەی دواییدا لە مالمێ وە دەعوەت کرابووم بۆ ئەوەی کۆڕێك بگێڕم دەوری **250** کوردێك هاتبوون ئەمە بۆ ئەو ناوە زۆرە. مالمێ کەوتۆتە خوارەوەی سوید و لە (کۆپنهاگن)ی پایتەختی دانیمارکەوە تەنها **40** دەقیقە بە پاپۆڕ

دووره ئێستا ئەیانەوێ پردێ دروست بکەن بە درێژایی 17کم کە ئیتر سوید بە تەواوی بە دانیمارکەوە ئەبەستێتەوە. کۆڕەکە باش بوو... من مەبەستم هەبوو لەو چوونە دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی لە وتەکەی خۆمدا هەندێ قسە بکەم ئەویش دەقی بڕگەیەکە کە لەوێ وتم "من ئازادم هەر بیروباوەڕێکی سیاسی هەڵبژێرم. بەڵام من وەك شێرکۆ بێکەس سەربەخۆیی خۆم بۆ هیچ کەس و لایەنێك لە دەست نادەم. من پێم وایە ئەو خوێنەی ئێستا لەبەر کورد ڕژا خوێنی هەموومانە. من تیرۆر و تیرۆرکەران ڕسوا ئەکەم هەر کەسێ بێ و هی هەر لایەنێك. خوێنی حەسەن کوێستانی و بەکر عەلی و ڕێناس و ئەحمەد حەلاق و فرانسۆ یەك خوێنن (لە سەرچاوەیەکەوە دێنە دەرێ کە ئەویش جەستەی کوردی قوربانیی خۆیەتی ... هتدد)! بەم جۆرە کۆتاییم بەو وتەیە هێنا لەگەڵ زۆر قسەی تردا کە دیارە هەموویم لە بیر نییە... پێم وایە چاکم کردووە!

براگیان: هەڵبەتە من زۆر تینووی هاتنەوەم چونکە بگەینەوە مانگی (10) ئەبێ بە دوو ساڵ کە لە ئێوە و وڵات دوورکەوتومەتەوە.

هەواڵەکان وا ئەگەینین کە ڕووناکییەك هەیە بۆ ئاشتی و ڕێکەوتن. ئەگەر خوا بکات ئەوە بێ ئەوا هاتنەوەکەم نزیکتر ئەکەوێتەوە. لە هەموو حاڵەتێکدا یان ئەم هاوینە یان سەرەتای پاییز ئەگەڕێمەوە. دیارە زۆر چاکترە ئەگەر دنیاکەی باشبوو هەر لەڕێی زاخۆوە بگەڕێمەوە. بە ڕاستی حەز ناکەم بە ئێراندا بگەڕێمەوە مەگەر چار نەمێنێ..

لەوانەیشە نەسرین بەر لە من بگەڕێتەوە... چونکە وا بڕیارە کە دایکی (کە ئێستە لێرەیە) بە ئێجگاری بگەڕێتەوە ڕەنگە نەسرین و هەڵبەست و خەسووم پێکەوە بگەڕێنەوە... بۆ خۆیشم جارێ نازانم" بەڕاستی من حەزئەکەم کتێب و چاپکراوتان بۆ بنێرم بەڵام یەکەم: کەس نایبات: دووەم لەو ڕێگاوبانانە ناوبەناو . کاغەزیش ئەکەنەوە و کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاریش گل ئەدەنەوە! بۆ ئاگاداری خۆیشت ـ کوردستانی نوێ ـ کەم پێ نەگەیشت چونکە فەرهاد خۆی تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی کە لەبەر ڕێ و بان نەموێراوە بیهێنم!

لەگەڵ ئەم نامەیەدا 100 دۆلارم ناردووە (50) دۆلاری بۆ خۆت و تایەر (50) دۆلارەکەی تریش بۆ حەمەڕەشید فەتاح داوای یارمەتی کردبوو گوایە ڕۆمانی هەیە منیش وتبووم – مەگەر لە گیرفانی خۆم شتێ بنێرم- نامەی نووسیبو کە باشە ئەوەی خۆت بنێرە! هەروەها نووسیبوی کە تکایە

یەکسەر بۆ خۆمی بنێرە بەڵام ئەو نە ئەدرەسی خۆی بۆ من نوسیبوو نە ژمارەی تەلەفۆن تکایە پارەکەی بۆ بخەرە ناو زەرفەکەوە- من زەرفەکەی ئەو داناخەم- و بیدەرێ و پێی بڵێ ئەمەت لە فلانەوە بۆ هاتووە. خۆیشم بۆی ئەنوسم کە خەڵکی ناتوانن بە شوێن ئەودا بگەڕێن! هەروەها نامەیەکی کاك شێرزادی تێدایە. لەگەڵ نامەیەکی تر بۆ دڵسۆز حەمە ئەگەر بە ئەرکی نەزانی بەشکوو بیگەیەنیت. ئەگەر دەرفەتیش هەبوو وەڵامی نامەکەی کاك مستەفاش ئەنێرمەوە. ئەڵێن چەمەکانت زۆرن و بە لێشاون تا ئێستا لەو چەمانەدا چەند کەس خنکاون؟! جەوهەر لێرەیە تا ئێستا یەکجار یەکترمان دیوە ئەو باسی چەمەکانی سلێمانی بۆ کردم ئەلێن قسەیەکی مەشهورت هەیە وتوتە "ئۆهۆو دیسانەوە گۆشتە حیزەکەیە!" وەڵڵا ئەگەر دنیای ئێوە وای لێ هاتبێ مانای وایە ئەو برسێتی و نەبوونییەی باسی ئەکەی درۆیە و دعایەی ئیستعمارە!

براگیان:

دیسانەوە جارێکی تر بە هیوای خۆشیتانم سڵاو و ڕێزم بۆ هەموو لایەك... نامەیەکی محمد موکری قەرزارم لە دەرفەتێکدا وەڵامی ئەدەمەوە.. سڵاوم بۆ هەموو برادەران تایەر. محمد نوری و هەر خۆشیتان کە هەواڵم ئەپرسن. هەربژین.

برای خۆتان

باوکی هانا

هەروەها فریاکەوتم کە نامەیش بۆ موکری بنووسم






سەرنج

لە ئاخر لەحەزەدا.. **75** دۆلارەکەم کرد بە
بە **100** دۆلار لە ترسی تایەر چونکە
بزانێ پارەم بۆ حەمە ڕەشید ناردووە جنێو ئەدا. بۆیە
وتم وا چاکە ئەوە هیچ (**50**)ەکەی ئەوە با **25**یش
بۆ ئەو بنێرم لەگەڵ **25**ی خۆتدا ئەوە **100**
باشترە.. ئەمە جگە لەوەی تایەر تاڕادەیەك مەغدورە!

# ڕۆژتان باش

به هیوای سەرفرازی و لەش ساغیتانم لەگەڵ هەموانی دڵسۆز و هەواڵی ماڵەوە و برادەران ئەپرسم.

کاکە گیان: دوا نامەم لە سیرِوانەوە بۆ ناردویت. دیارە پێت گەیشتووە. ئەوا نزیکەی مانگێکە هاتووینەتە ئێرە. ماوەیەك هەر پەرەوازە بووین. وا ئێستە هەفتەیەك زیاترە لە کەپری خۆمدام.

جارێ سامیشم لەگەڵە. حاڵ و ئەحواڵم باشە و ئیش و کارمان باش ئەڕوا و ئەگەر مەسەلەی چاپخانەکان بە تەواوی جێگیر ببێ گیر و گرفتمان نامێنێ. ماددەکانتان هەمووی گەیشت زۆر زۆر سوپاستان ئەکەین. ئێستە ژمارەی نووسەر ئامادەیە بۆ چاپ بەڵام وەك وتم ئێستە –تایپێست- هەر یەکێکە و ئەویش فریای هەموو ئەم ئیشانە ناکەوێ بۆیە چ نووسەر و چ بەرهەمەکانی داهاتوو بە کۆمەڵە چیرۆکەکەی تۆیشەوە دوائەکەون. بەڵام باوەڕناکەم چارەسەر نەکرێن. بە هۆی گواستنەوەوە چاپخانەکەمان هەر تەواو وەستاوە. لاکانی تریش کاروباری خۆیان هەیە. یەعنی بەرهەم و نووسین لای ئێوەوە زۆرە بەڵام مەسەلەی چاپکردنە نەك تەمەڵی و گوێ پێ نەدان. ئێستە کاك مارفیش

هەر لەم ناوەیە و سڵاوی هەیە.
کاکە گیان: هەر لە ماوەی ئەم دوو هەفتەی ڕابوردوودا. شیعر وەکوو باران بە سەرما داباری. دوای ئەوەی نزیکەی (3) مانگ چۆڕە بڕ بووبوو. شەش قەسیدەی تازەم نووسیووە درێژەکەیان (19) لاپەڕەیە لەم ڕۆژانەدا (نەفرەت) یان بە دەنگی خۆم لە ئێزگەوە ئەخوێنمەوە. ڕەنگە ئیزافەیەکی تربم بۆ شیعری کەشکۆڵەکان و دنیای پێشمەرگ لە ژیانی ڕۆژانەیان. لەبەرئەوە بەرگی (3)ی کەشکۆڵیش هەر ئامادەیە بۆ چاپ. لەولای تریشەوە پرۆژەی مقابەلەکەم تەواو بووە ئەویش هەر لەسەر چاپ وەستاوە چیرۆکەکە (کارگە) ئەنجامێکی زۆر نامەنتیقی هەبوو ئەوەم چاوەڕوان نەئەکرد لە تۆ. ئەوەی کە نەقدەکەی لەسەر نووسیووە نەمزانی کێیە؟!. نووسینەکە خراپ نییە... بەڵام هەندێ بۆچوونی زیاتری تێدابوو کە پەیوەندی بە چیرۆکەکەوە نەبوو. لەبەرئەوە چەند پەرەگرافێکمان لابرد. حەمە لە دێ ی (مێولاکە) گیرساوەتەوە و ماڵی گرتووە. کە نزیکی گوندی چوخماخە و لەگەڵ زیرۆدا پێکەوەن.
کاکە گیان: لە نامەی پێشوودا هەندێ دەنگ و باسم بۆ نووسیبوی. لەوە ناچێ کۆمەڵەکەی سالار بوەستن یان دابنیشن چونکە لەلایەن سوریا و لیبیا و ئێران و جودەوە دەعم ئەکرێن و کراون. تەنانەت پارەیان لە لیبیا وەرگرتووە. من وەڵامی نامەکەی سالارم وەرگرتەوە. توندوتیژە و هێرشیش بۆ سەر مام و نەوەیە.
داوای کردووە ئێمە بێ تەرەف بین دیارە هەر وایشە. بەڵام ئەمەیان تەنها شتێکە کە ئێستە بیری هەمووومانی جەنجاڵ کردووە. مەسەلەکە ئەگەر هەر سالار بێ گرنگ نی یە. بەڵام هەر کاتێ تەقییەوە. بێ گومان مەلا و ئەوانی لەگەڵدا ئەبن. ئەمە جگە لەوەی زۆر وەکو کاك عومەر و ئازاد هەورامی و ئەوان دائەنیشن هەڵبەتە ئەمە سەرباری وەزعی کورد شتێکی ناخۆشە. ئەوەتا ئەوپەڕی بەحساب چەپڕەو ئێران دەعمی ئەکا و گوێش ناداتە ئەوەی کورد چی لێ دێ و چی لێ نایەت. پێم وایە ئێستە کە ئێران و عێراقیش ئاوڕ لە ئێمە نادەنەوە مەسەلەکە ئەوەبێ. یان بەشێکی بێ. چونکە لەڕێی دیموکراتەوە لە بەغدا ئەوەیان دابوو بە گوێدا کە (یەکێتی ئەو هێزە نییە وەك خۆی تەسەور ئەکات ئەوەتا زۆری لێ تەسلیم بۆتەوە و جگە

لەوەی ئینشقاقی تێ کەوتووە). ڕاستی ئەو خەڵکە کە تروسکایی لە ی.ن.ك ئەبینن ئەوەتا ئەمەش دێت سەرباری. ڕەنگە تا چەند مانگێکی تر ئەمە دەوام بکات ئینجا ئیعلانی تەواوی بکەن. تەنانەت ئێزگەیشمان بۆ ئامادەکراوە!!

کاکە گیان: وەکو لە نامەی پێشوودا بۆم نووسیبوی مسوداتی (ڕەنگانە)م بۆ وەربگریتەوە. ئەمڕۆ نامەیەکی (فؤاد عبدالرحمن) م بۆ هات ئایا لە شارە؟! چۆن؟! تێ نەگەیشتم بۆ نووسیبووی هەڵگری ئەسڵی نامەکەم نەبینی تا قسەی لەگەڵدا بکەم دابووی بە یەکێکی تر.

ئەگەر توانیتان بە ناسیاوێکدا چەند پاکەتێك گولاجی ڤیتامین K5 . B بۆ بنێرن. ئەم شوێنەی ئێرەمان جێگەی گەڕان و پیاسەی نییە. لەبەرئەوە وادەی کۆچ هاتووە. هەر دار و هەر بەرد و هەر ئاو هیچی تر! سڵاو و ڕێز و خۆشەویستیم بۆ کاك نالە و قالە و مچە و حمەنوری وە نامەیەکی کاکە مچەم پێگەیشت (هەمووی داخی دڵ هەڵڕشتن بوو) هەواڵی هونەری عتوریشی پرسیوە ئای لەو سەروو دڵەی پێوەیەتی... ئاش لە خەیاڵ و ئاشەوان لە خەیاڵێ... لە کۆتاییدا ڕێز و خۆشەویستم بۆ هەموو لایەك و هەر بژین.

کاکەگیان: تکایە ئاگات لە خۆت بێ دوژمن هەر تەواو دڕ بووە.

ڤیدیۆکەش هەر خۆت سەرپەرشتی بکە و مەهێڵە لەبەری بگیرێت

براتان

جوامێر



برای خۆشەویست و ئازیز
هاوڕێی شیرین باوکی ئازاد
ڕۆژتان باش ..



بە هیوای چاو و دڵ ڕوونی و سەرفرازیت لەگەڵ هەموانی دڵسۆزدا، ڕێزی زۆرم بۆ دایکی ئازاد و چاوی منداڵان ماچ ئەکەم...

کاکە گیان: جارێکی تریش لە لێژبوونەوەی تەمەندا ڕووم کردە شاخ. ئەمجارەش وا چارەنووسم داوەتەوە دەس داهاتوویەك کە کەس پێش بینی ناکات. نەمتوانی لەوە زیاتر لەژێر سایەی مێردەزمەی ڕژێمدا بژیم. هەموو شتێکم خستە لاوە و بە ئێجگاری ماڵ ئاواییم لە ژیانی شار و تەنانەت ماڵ و منداڵ و هەموو بەرژەوەندییەکی شەخسی کرد. ئەمە سێیەم جارە ئەم شاخ و داخانە ئەبنەوە لانکەم. ناتوانم درۆ لەگەڵ قەناعەتی خۆمدا بکەم. ناتوانم بەدەم شتێك بڵێم و بەکردەوە پێچەوانەکەی دەربخەم. نە لە شۆڕشی ڕابردوودا پارتی بووم و نە ئێستەش بە ئینتیما لە یەکێتی نیشتمانی دام. ئەوسا و ئێستەش من دۆستی شۆڕشگێڕان بووم و سەنگەری ڕاستەقینە لەکوێ بووبێ شیعری منیش لەوێ بووە. لە ئێستەشدا تەنها هێزێکی گەورە کە لەم مەیدانەدا بێ و نەخزابێتە ئەو دیو سنوور و

دەور و کاریگەری هەبێ و بەسەرهات دروست بکات پێشمەرگەی یەکێتییە.
ئەمە حەقیقەتە و نەبەدر و مەیدانەکانی جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی ڕۆژانە هەر لە دەشتی گەرمیانەوە تا باڵەکایەتی دەری ئەخەن. موعارەزەی حەقیقی موعارەزەی دەم و قسە نییە بەڵکوو دیاربوونی جێ دەستە لە ساحەکە خۆیدا.
لە ماوەی **(6)** مانگی ڕابردوودا زیاد لە **2500** کەسی دوژمن پیاوی ڕژێم لە سەرباز و جاش و پیاو خراپ کوژراون زیاد لە **(70)** ڕەبایەی دوژمن داگیرکراون و سووتێنراون.
سەدان پارچە چەکیش دەستکەوت بوون شەڕەکانی چیای چەرماوەند و دابان و دۆڵی سورداش و قەرەچووغ و سەرشەقامە گشتییەکانی کەرکوک- هەولێر و ئینجا شەڕە گەورەکەی زینانەی گەرمیان و دۆڵە ڕەقە و لە ددواییدا شەڕی کەتوو بریتین لەو داستانانەی شیعر عاجزە لەوەی بتوانێ تەعبیریان لێ بکات. ئەمانە وان لە هەمان کاتیشدا وەك ئەزانی وەزعە سیاسیەکە لە ناوچەکەدا تێکرا بە سەرئەنجامی شەڕی ئێران- عێراقەوە بەستراوە. مەسەلەی کوردیش بۆتە پاشکۆی ئەو شەڕە. جاران کێشەی ئێمە لە خانەی یەکەمدا بوو، بەڵام ئەمڕۆ کەوتۆتە خانەی دووەم و سێیەمەوە. ڕژێم زۆر درِاندانە لێمان ئەدات. جگە لەوەی کە لە ساڵانی ڕابوردوودا سەدان گوند ڕاگوێزاوە. لە ماوەی ئەم شەش مانگەی ڕابوردوودا لە هەر ناوچەیەکدا پێشمەرگە لێی دابن کام شوێن نزیکی ناوچەی شەڕ بووبێت دوایی سووتاندویانە. ئێستە ناوچەی وا هەیە یەك گوندی تێدا نەماوە بێ گومان ئەوەی لە واقیعەکە خۆیدا نەبێ نازانێ ئەمە چ مەترسیەك بۆ ژیانتی پێشمەرگە دروست ئەکات.
لەلایەکی تریشەوە بە درێژایی مێژوو کورد ئەمەندە جاش و پیاو خراپی نەبووە دەسەڵات و ئیمکانیاتی ئێمەش زۆر سنووردارە. بە بەراورد لەگەڵ ساڵی **1974**دا یەك بە دەش نییە. بێ گومان ڕژێمیش بە تەنها بە ئێمە ناڕوخێ و بەغداش بە ئێمە ناگیرێ!! موعارەزەی تریش لە واقیعدا تەنها لەسەر کاغەز و بە دەم هەن لە ماوەی **(5)** مانگی ڕابوردوودا هەموو بەرەی جود لە ناوچەی بادینانداـ کە تەنها ناوچەی خۆیانە- تەنها **(3)** چالاکی عەسکەرییان کردووە نزیکەی **(20)** سەربازێکیان کوشتوە و **(20)** چەکیان دەست گیر بووە!! بێ گومان من ئاواتم ئەوەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەموو بەرەی موعارەزە و شۆڕش یەك بگرن بەڵام لەوەناچێ لەبەر ناکۆکییە

سیاسیەکان ئەم حەز و خۆزگەیە بێتە دی.

ئەمە بەگشتی دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە و وەزعی ئێمە. دەربارەی خۆیشم لەوەتەی لە شاخم خوێندنەوە و نووسینم هەر بەردەوامە. لە مانگی چواردا درێژترین گەشتی شیعریم بە ناوچە ئازادکراوەکاندا کرد. لە دەیان گوند و مەڵبەند و لەناو هەزاران پێشمەرگە و جوتیاردا شیعرم خوێندۆتەوە. لەڕێی بێگەردەوە ئەتوانی کۆڕێکیان ببینی کە بە ڤیدیۆ گیراوە. ئێمە ئێستە کەوتوینەتە بەینی دوو بەرداشی شەڕی ئێران عێراقەوە هەر هەنگاوێکی سیاسی بۆ هودنە یان گفتوگۆ بنرێت هەر لەبەرئەوەیە هێزەکانی خۆمان بپارێزین و هیچی تر ئەگینا پێویست ناکات بڵێن دوژمن کێیە و کێ نییە. لە مفاوزات وتیان ئێمە بوینەتە جاش و جارێکی تر تەقە لە لوولەی تفەنگی ئێمەشەوە نایەتەوە واش بوو بەڵام کە شەڕیشمان کردەوە بەو جۆرە کردمانەوە کە دۆست و دوژمن ئەیزانێ چی نەکرد. بزوتنەوەی چاپەمەنی لێرەو و لەناو ئەم شاخانەدا بە بڕشتە لە ماوەی (6) مانگی ڕابردووەوە تا ئێستە زیاتر لە (60) کتێب و نامیلکەی سیاسی – ڕۆشنبیری- ئەدەبی دەرچووە. لە دوا ڕۆژدا لە هەر لایەکەوە فرسەتم بۆ هەڵکەوێت نیازم وایە ئەو گەشتە شیعرییەمی بخەمە وڵاتەکانی ئەوروپاشەوە. طبعن بە سەفەر و بەڵام قەت کوردستان بە ئێجگاری بەجێ ناهێڵم. سڵاو لە هەموو برایان ئەکەم بەتایبەتی (ج). ئەگەر (ی) دی لە بەغدا گلەییم لێی هەیە چونکە ئەو شتێکی دەربارەی شیعری من نووسیبوو کەچی وتبوی مادام سەر بە (إتحادە) بڵاوی نەکردبۆوە!! ئایا ئەمە بیرکردنەوەی ئەدەبیانەیە. من دۆستی هەموو شوڕشگێرێکم. بەڵام وەك کوردێك کە مەسەلەی نەتەوەیی خۆم لە پێشترە. ئەم مەیدانەم هەڵبژاردووە. لە کۆتاییدا هەربژیت و هەربژیت گیانەکەم.

جوامێر





ستوکهۆڵم

**10/8/1987**

برای بەڕێز و خۆشەویست و جگەرسۆزم

کاکە بێگەرد

ئەم کاتە و گشت کاتێکتان شاد

بە کوڵ و دڵێکی پڕ لە تاسەوە ئەم لاو ئەولات ماچ ئەکەم. دەستەکانت ئەگوشم. بە هیوای لەش ساغی و چاوودڵ ڕوونی و بێ وەییتانم. ڕێزی زۆرم بۆ دایکی منداڵان و ئینجا چاوی یەکەیەکەی منداڵان ماچ ئەکەم. سەلام و ماچ و دەست گوشینی ئەوپەڕی سۆز و تاسەم بۆ برایانی خۆشەویست: حەسەن بێ ژن و ڕەحیم و قالە و سێ تەنگە و هەموو دڵسۆزان.

کاکە گیان: لە کاتی خۆیدا و لەو لاتەی ترەوە چەند کارتێکم بۆ ناردبوویت هەروەها بۆ برادەرە خۆشەویستەکانی تریشم جا نازانم گەیشتوون یان نا؟!! هەرچۆنێك بێ ئەوا من دوو مانگە لەم وڵاتی باران و بەفرەم- لە ساڵێکی ڕەبەقدا یەك مانگی خۆش هەیە. ئێستە کە ئەم نامەیە ئەنووسم سەعات **(11)** ی شەوی ئێرە وەکو سەر لە ئێوارەی

خۆمان هەر ڕووناکە!. خەوتن و هەستان و ئەو شتانەم هەمووی لێ گۆڕاوە. وردە وردە خەریکم دابمەزرێم. بەڵام ڕاهاتن لەگەڵ ئاووهەوا و سروشتی ساردوسڕی ئەم خەڵکەی ئێرە و ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە میکانیزمەدا ڕەنگە وەختێکی زۆری بوێ تا دەستەمۆم بکات. خۆشەویستی و سۆز و عاتیفە و دراوسێ و بەسەرکردنەوەی لای خۆمان ناڵێم هەر نییە، بەڵام پێویستە بە چرای ڕۆنگەرچەکەوە بە شوێنیاندا بەگەڕێی ی! لێرە هەموو شتی بە فەرمانی کۆمپیوتەر و بە ئاماژە کردنی ئەو ئەڕوات بەڕێوە. لە بارەی دەروونییەوە هەست بە تەنیایی یەکی زۆر ئەکەم. زۆرەی وەخت هەر لە ژوورەکەی خۆمدان. لەپاش ماوەیەکی تر کۆرسی زمان وەرئەگرم. ئەویش وەختێکی زۆری ئەوێ و ئەبێ بەردەوام خۆمی بۆ ماندوو بکەم- بڕوا ناکەم تاقەتم هەبێ- لە بارەکەی ترەوە ئەو بارەی کە ژیانمان بۆ تەرخان کردووە زۆر زۆر باشم و بە دڵی تۆ. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەرگای تازەتر و گەورەترم لەسەر ئەکرێتەوە گۆرانیەکانم لە ئاسمانی بەرینتردا لە شەقەی باڵ ئەدەن و سنوورەکان ئەبڕن.

بەشێك لە گۆرانیەکانم بەتایبەتی کورتەکانیان هەر زۆر زۆر وەك هونەری دەربڕین و بابەتی تازە پێشوازیان لێ ئەکرێ. باس ئەکرێن. لەگەڵ لاوە خەڵات کراوم و خەڵات ئەکرێم و داوای سەردان و میوانداریم لێ کراوە. شتی جوان بە دەنگی خۆش لە هەموو شوێنی هەر جوانە و ڕێگەی خۆی هەر ئەکاتەوە. لەم ڕووەوە جێ دەستم دیارە. لەم ناوە خەڵکی لای خۆمانی زۆر لێ نی یە هەندێ جار ئەیانبینم . ف. جاف و شاکەلی وئومێد و خەبات و کاکەیی و زۆریتر لێرەن و هەریەکەی سەرقاڵی ژیان و گوزەرانن. بەینم لەگەڵیاندا باشە. ماڵ و منداڵ قۆناغێکیان بڕیوە و بۆ قۆناغی دواتریش ئەبێ چاوەڕێ بکەن هەتا لێرەوە کارەکانیان بۆ جێبەجێ ئەکرێ بەڵام ئێستە دڵنیاترم و دەربارەی ئەوان دڵەڕاوکێی جارانم نەماوە. هەر وەختێ ئەوان بگەن ئەحەسێمەوە. لێرە دەقیقە و بگرە سانیە حسابی بۆ ئەکرێ.

- بۆ نموونە بەر لە دوو دەقیقە کە پاس یان ترام بڕوات خەڵککەی لەژێر چەترەکاندا یان لە ئێستگەکاندا خڕ ئەبنەوە- چونکە هەموو وەسیلەیەکی هاتوچۆ بە بەرنامەیە و جەدوەلەکانیان هەڵواسران و یەك دەقیقە پاش کەوتن و پێشکەوتن یان تێدا نییە. شت نییە لەم وڵاتەدا دەست نەکەوێ. بە تەلەفۆن هەموو شتێ ئەکرێ- تەنانەت مەکتەبی ژن هێنانیش هەیە و ئەتوانی بە تەلەفۆن سۆراخی ئەو ژنە بکەیت کە ئەتەوێت بیهێنی.



لەوسەری ئەم وڵاتە ئەمڕۆ سەعات (8) ی بەیانی نامەیەك بخەرە پۆستەوە بۆ سبەینێ بەیانی لە سەعات (8)دا لە دوورترین شوێن و لەوسەر ئەگاتە دەست ئەوەی بۆت ناردووە. مانگانە بە سەدان گۆڤار لە چاپ ئەدرێن، ئەڵێم سەدان نەك دەیان- تەنانەت گۆڤار بۆ سەگ و ئەسپ و پشیلەش هەن- ئێمە هەزار ساڵێکی تر ئەگەینە ئەمەی ئەمان پەلەمان چی یە؟! چی بکەین کاکە چی بکەین؟!- . بۆ ئەوەی چاکتر تێ بگەی مەسەلا بۆ ژووری نووستنی منداڵ گۆڤاری مانگانە هەیە. بۆ مەتبەخ- بۆ سێکس بە دەیان- بۆ جل و بەرگی ژنانە و پیاوانە بە دەیان- بۆ کشتوکاڵ و لقەکانی بە دەیان ئیتر ئاوا! ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤیان هەر تەواو ئاسان کردووە. ناخۆشیان کردووە. سەربەستی خەڵکەکەش بێ سنوورە. هەندێ جار ئەگاتە ڕادەی ئەوەی ئێمە قێزی لێ بکەینەوە. بۆ نموونە ڕۆژێ لە دەرەوە بووم ئەو شوێنەی ئێمەی لێ دانیشتبووین لەو لامانەوە ژن و پیاوێك دەمەقاڵێیان بوو. بە یەکدا هەڵپژانەوە. پیاوەکە کەمێ توورە بووبوو. پرسیم ئەوە چییە؟! وتیان ئەوە ئەو پیاوە ئەڵێ: ئەمە سێ ساڵە ژنمە بەڵام ئەمڕۆ کوڕێکی دیوە و حەزی لێ کردوە و وا ئیتر بەمن ئەڵی ـ های دۆ ـ های دۆ یەعنی خواحافیز. چۆن؟! وتیان وایە و ئیتر ژنە بۆ خۆی ئەڕوات و تەواو!! هەڵبەتە دووراو دوور کە ئێمە شتمان دەربارەی ئێرە ئەبیست زۆری وا نی یە. بۆ نموونە لای ئێمە وا ئەزانی کە پیاوێك گەیشتە ئەوروپا ئیتر ئافرەت پەلاماری ئەدات. وا نی یە. بەڵکو لێرە گرانترە چونکە بە هەڵبژاردنە و بە ئیختیاری ئافرەتەکەیە بە دڵی بوویت تەواو نەبویت نی یە. ئەوەی دەوریشی نی یە قۆزی و جوانی یە واتە شکڵ. بڕوا بکە ئافرەتی وا شۆخ و شەنگ لەگەڵ هەندێ قولەڕەشدا ئەبینم ڕەنگە بێتە خەویشم زراوم بچێ. هەڵبەتە زمان زانین و تێکەڵاوبوونیش دەوری خۆیان هەیە. لێرە مستەوای ژیان گورزەران زۆر چاکترە بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی وڵاتەکانی تری ئەوروپادا. لەم پایتەختە گەورەیەدا وەکو باسی ئەکەن ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان بە پارە ئەفرۆشن ناگاتە (100) ئافرەتێ دیارە ئەمە هەر هیچ نی یە. بە پێچەوانەی ئەڵمانیاوە یان فەڕەنساوە. نازانم چیت بۆ بنووسیم دیارە جارێ هەر وڕ و گێژم و تازە بە تازە ئەتوانم بە تەنیا بچمە دەرەوە بۆ سەنتەری شارەکە و بگەڕێمەوە. لێرە ئەگەر مسقاڵێ هەتاو بە هەزار کرۆن بوایە خەڵك هەبوو بیکرێ. گوایە من لە فەسڵێکی خۆشدا هاتووم و لە هەڕەتی هاویندا، ئەوەتەی هاتووم دووسێ ڕۆژم دیوە خۆش بێ باقی تر هەر هەورە و بارانە. زستانی ئێرە ئیتر لەپاش مانگێکی تر دەست پێ ئەکات و کەوترا زستانیش ئیتر بڕانەوەی نییە، ئەو بەفرەی باری خۆشکردنەوەی نییە- بە دەیان دەرەجە لەژێر سفرەوە- بەڵام خۆت بکەیت بە هەر شوێنێکدا گەرم و گوڕە و هەست بە سەرما کردن نی یە



مەگەر لە پەڕینەوەی شەقامێك دا. ئینجا سەیر ئەوەیە ئەو هەموو بەفرەی ئەبارێ بۆ بەیانیان کە خەڵکەکە بەرەو کار ئەچن هەموو شەقامەکان وا پاککراونەتەوە ئەڵێی هەر بەفریش نەباریوە! من تەلەقفۆنم بۆ ژورەکەی خۆم بە (10) دەقیقە وەرگرت! لەگەڵ باراوی دا چوین. ئیبستیمارەیەکمان پڕکردەوە. دوای ئەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی ڕیزێ ژمارە دەرکەوتن و بە منیان وت فەرموو وتم چی یە؟! وتیان کام ژمارەت ئەوێ و تەواو- باراوی زۆر خزمەتی کردم باوەڕ ناکەم برایەکم لێرەبوایە بە قەدەر ئەو بۆ من باش بوایە، ئەو و کۆمەڵێ خەریکی جموجۆڵی شانۆن و تیپێکیان هەیە و تا ئێستە دوو سێ کاری باشیان کردووە- لەولای تریشەوە ف. جاج و ئەوان تیپێکی تریان هەیە و خەریکن. جێی داخە کە لێرە و لە ئەوروپادا کوردەکە زۆر زۆر ناکۆکی و ناتەبان لەگەڵ یەکتردا! لە ئەوروپادا بە کرمانجی ژوور و خوارەوە نزیکەی **30-20** گۆڤار و ڕۆژنامە هەن کە بە کوردی دەرئەچن بەڵام بێ برشتن و لاوازن. ئێمە هەر هەموومان ئەگەر کۆششی خۆیشمان یەك خەین ئینجا بتوانین گۆڤارێك یان دووان- کە پێیان بوترێ گۆڤار- دەربکەین بەڵام کێ گوێ لە کێ ئەگرێ؟!

کاکەگیان: بە ڕاستی بیرتان ئەکەم. خەوتان پێوە ئەبینم. زۆرجار کە تەنیا ئەبم بە یادی جارانەوە گۆرانیەکانی ماملێ لەبەر خۆمەوە ئەڵێم و تۆ و دەنگە خۆشەکەتم بیر ئەکەوێتەوە. چاوم پڕ ئەبێ لە ئاو. بەڵام ئیتر ئەمە ژیانە و سەردەمی کۆچ کردنە. سەردەمی لێك دابڕانە. بەڵام تۆ بڵێی لەم ئاوارەیی و دەربەدەریەدا هەروا بژین و جارێکی تر چاومان بە یەکتر نەکەوێتەوە؟! نازانم... دیسانەوە سڵاوم بۆ برادەران. نامەم لێ مەبڕن. ئەگەر بتوانن ناوبەناو چاپکراوەکانم بگەینێ ئەوانەی ئەهێنن بخوێنرێنەوە ئەوا زۆر دڵخۆشم ئەکەن. دەی! با بڵێم هەربژین و خوات لەگەڵ.

برای دڵسۆزتان

شەریف

ناونیشان:

M. SH. B.

ProfessorssL 23/014

Stockholm. Sweden 10405

پاشکۆی نامەکە

کاکە بێگەرد

- ئەوەی ڕاستی بێ گەلێ حەز ئەکەم سەرێك بدەمەوە سەرێکی دوورودرێژ بەڵام من هەموو ڕێگاکانم لە خۆم کردووە. لەگەڵ ئەوەیشدا داوای ڤیزە ئەکەم بزانم ئەیدەن یان نا؟!. سەید عەلی ساڵحی - دنیای سخن - ئامادەیی خۆی نیشانداوە بۆ ئەوەی قەسیدەی کۆچ کە ئێستە کاك سلاح مهتدی خەریکە تەرجومەی فارسی بکات، بیکات بە کتێب ڕەنگە تا مانگێکی تر بۆی بنێرم. کاکە: تکایە بەشکو جواب لە کامبیز بگێڕیتەوە چی کرد بۆ لە چاپدانی دەربەندی پەپوولە ئەگەر لەوێ ناکرێ با بۆ خۆمی بنێرێ لە نامەیەکیشدا هەمان شتم بۆ ئەژی نووسیبوو بەڵام دەنگیان نەبوو. نازانم بۆچی؟!

- هەڵبژاردەی تەرجومەی شیعرەکانم لەم ڕۆژانەدا بە زمانی مەجەڕی دەرچوون و چەند دانەیەکم پێگەیشتووە. وا لەگەڵ ئەم پۆستەدا دانەیەکتان بۆ ئەنێرم.

- دەربارەی تەرجومەی "خاچ و مار" ئەوەی ڕاستی بێت ئەو پارەیەم نییە و زۆرە و بە من هەڵناسوڕێ!.

- ئەو (250) دۆلارەی لاتە هەڵیگرە تا ئەو کاتەی "دوای چاپکردنی دیوانەکە لێرە" جوابت لێ ئەگێڕمەوە

- تکایە بایەخ بە مەسەلەی کاسێتەکە بدە هەروەکو بۆم نوسیبویت.

کار بۆ "المنار الکردی" و "کوردستانی نوێی" دەرەوەی وڵات بکە ... کەچی ئیتر دەنگیان نەبوو.



چونکە کاك قادر زوو زوو بە من ئەڵێ. ئێستە سامی لەوێ نەماوە. فازڵ قەساب بەشی زۆری ئیشەکان ئەکات. سلاح شوان هەوڵ ئەدا بۆئەوەی لە ئەمریکاوە بێت بۆ لەندەن. وەزعی مادی زۆر خراپە ئەگەر بگاتە لەندەن ڕەنگە هەر لەگەڵ فازڵ و ئەواندا لە کوردستانی نوێ کار بکات.

- ئەگەر کاك برزو بتوانێ هەر بەودا دوو دانەی تر "خاچ و مار"ت بۆ ئەنێرم لەگەڵ دوو دانەی چاپی دووەمی "ئافات" تکایە بیدە بەو کتێبخانانەی کە نیانە.

- من وای بە باش ئەزانم ئەگەر سروودەکانی مەلەك تاووس بدەیت بە "ئێستا" یان "گەلاوێژی نوێ" بۆ ئەوەی بڵاوی بکەنەوە. با پێشەکییەك ئەو نوسینەی لەگەڵدا بێ کە شەماڵ عومەر نوسیویێتی. بڕیاربوو تۆ لەسەر خاچ و مار بنوسیت ئایا هیچت نووسی؟! تکایە یەکێ لە قەسیدەکانی تریش بدە بە یەکێك لەو دوو گۆڤارە!.

- تکایە تەعلیقی گۆڤار و ڕۆژنامە ئەڵمانییەکە لەسەر دیوانە تەرجومەکراوە ئەڵەمانیەکە لە شوێنێکدا بڵاوبکەنەوە.

دیسانەوە خۆشیتان

شێرکۆ

تێبینی

جگە لە **100** دۆلارەکەی خۆم بۆ شیخ عەبدول و خاڵم **100** دۆلاری تر لەگەڵ نامەیەکدا ئەگەر ئەرك نەبێت بیگەێنیتە کاوەی ژن برام و سوپاس واتە **200** دۆلار لەگەڵ ئەم پۆستەدایە

# دایکم

## شێرکۆ بێکەس



دایکم... هەر لەوێیە... دایکم
لەوە ئەچێ
بووبێ بە کرێچی پایز
بە شۆڕەبی سەر لە رۆژکی
کەنار چۆمێ، لەوێ دایکم.
دایکم... هەر لەوێیە دایکم.
من ئەزانم ئەمێستاکە
لەناو بوولێڵی غوربەتدا
بووە بە ئاو.



ڕەنگی بێڕەنگی گرتووە...
بۆنی بێبۆنیی گرتووە.
"تەنیایی" بووە بە کچی و
"نامۆیی" بووە بە کوڕی و
تازە نایەتەوە دایکم!

وەختێ پیری بە گۆچانەکەی
دەستێوە
خاو خاو دێت و وەکو خەونێکی
زەردەڵە
پەیدا ئەبێ و هەناسەسوار، هەر وەك



دایکم،

لەسەر سەکۆیەکی پاییز دائەنیشێ.

تەزبیحەکەی لە باخەڵی سوخمەی مۆری

دەرئەهێنێ و چاو ئەبڕێتە گەڵای بەر پێ.

لەو ساتەدا هەوای وەشتێ، بۆن و بەرامەی

یادگار، لە بیرەوەری دوورەوە، زۆر دوورەوە.

بۆ ئەو دێنێ. بەبێ ئەوەی پێبزانێ،

زەردەخەنەیەك ئەیگرێ و، بە بێ ئەوەی

پێبزانێ،

چەند دڵۆپێکی سەرگەردان دێنە خوارێ و
خەو تەڕ ئەبێ،
تا ئەو کاتەی زەردەپەڕی دەستە
خوشکی
دەستێ ئەخاتە سەر شانی و تا ئەو
ساتەی،
بە برووسکەی پەڵە هەورێ،
هەڕەشەکەر،
دائەچڵەکێ!
**سلێمانی ـ کۆتایی مایسی 2011**





# من و شێرکۆ بێکەس و وەرگێڕانی شیعرەکانی

**ئازاد بەرزنجی**

سەرەتای ناسینی من بۆ شێرکۆ بێکەس دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای لاویم، سەروەختێ کە سەودای شانۆ لە سەری دابووم و بەرلەوەی بە شێوەیەکی ئەکادیمی ئەو هونەرە بخوێنم ، وەکو شانۆدۆستێك لەگەڵ هەندێ هاوڕێمدا لە تیپی نواندنی سلێمانی کۆبووبووینەوە و ناوبەناو لەو شانۆگەرییانەدا بەشداریمان دەکرد کە لەلایەن ئەو تیپەوە پێشکەش دەکران. ئەودەمە هەمووی ساڵێك دووساڵ دەبوو لە باشووری عیراق گەڕابووینەوە بۆ سلێمانی، چونکە دوای ئەوەی لە ئێران گەڕابووینەوە؛ بەعس نەفیی کردبووین بۆ زۆنگاوەکانی ناسرییە و ماوەی دووساڵی ڕەبەق لەوێ ماینەوە تا لێبوردنێکمان بۆ دەرکرا و لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٧ دا لەگەڵ ماڵەکوردەکانی تردا گەڕاینەوە بۆ

سلێمانی . لەبەر ئەوەی لە باشوور خوێندن و خوێندنەوەشم بە عەرەبی بوو؛ زمانی عەرەبییەکەم باش بوو.

هەر بە گەڕانەوەم بۆ سلێمانی؛ وەك تینوویەك بۆ كتێبی كوردی، دەستم دایە ئەو كتێب و سەرچاوانەی كە هەم لە كتێبخانەی قوتابخانەكاندا و هەم لە كتێبفرۆشییەكان دەستم دەكەوتن، هەر لە چیرۆك و ئەو چەند ڕۆمانەوە بگرە كە ئەوسا هەبوون تا دیوانی شاعیرە كوردەكان بە كلاسیك و نوێیانەوە.

یەكێك لەو شاعیرانەی كە زۆر چێژم لە شیعرەكانی دەبینی و هەستم دەكرد ئەودەمە ئاوێنەی بالآنمای ئازار و موعاناتەكانمانە وەك ئینسانێكی كورد؛ شێركۆ بێكەس بوو. هەر بۆیە بە شەوقەوە هەر بەرهەمێكی تازەی دەربچووایە دەمخوێندەوە.

ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن تیپی نواندنی سلێمانییەوە شانۆگەریی "دكتۆر پاڵمی" پێشكەش كرا، كە سەرەتا قەرار بوو هونەرمەندی بەتوانا كاك فازیڵ جاف دەریبهێنێت، بەڵام لەگەڵ هەڵایسانی ئاگری جەنگی عیراق ـ ئێران دا ، ئەو بەرەو هەندەران كۆچی كرد و هونەرمەندی خوالێخۆشبوو "جیهاد دڵپاك" دەرهێنانەكەی گرتە ئەستۆ. ئەمە بۆیە باس دەكەم چونكە شانۆگەرییەكە لەلایەن كاك شێركۆ بێكەسەوە لە عەرەبییەوە كرابوو بە كوردی و بیرم دێ ڕۆژێكیان كاتێ ئێمە لە تیپ سەرگەرمی پرۆڤە بووین؛ وتیان كاك شێركۆ دێت و حەز دەكات گوێ لە خوێندنەوەی پرۆڤەكەمان بگرێت. ئیتر ئەوە بوو كاك شێركۆ هات و لەگەڵماندا









دانیشت. من ئەوە یەكەمجار بوو كاك شێركۆ لە نزیكەوە ببینم . هەڵبەت من ئەوسا كوڕێژگەیەك بووم و هیچی تر، بینینی شاعیرێكیش كە لەو ڕۆژگارەدا وەكو سیمبوڵێكی شیعری نوێی كوردی و لە هەمانكاتدا شیعری بەرەنگاری ناسرابوو، بۆ من مایەی خۆشحاڵییەكەی تایبەتی بوو. بەهەرحاڵ دەستمان بە خوێندنەوەی دەقە شانۆییەكە كرد و دواتر كاك شێركۆ پرسیی كە ئاخۆ زمانی وەرگێڕانەكەمان بەدڵە یان نا؟ هەموو وتیان كە زمانێكی ڕەوانە بۆ



ئەکتەر و تا بڵێیت جوانە. لەڕاستیشدا هەروابوو. بەڵام چەند وشیەك هەبوون کە من زانیم بە هەڵە تەرجەمە کراون و دواتر بە شەرمێکەوە وتم کە من ئەم سەرنجانەم هەیە و سەرنجەکانی خۆم خستەڕوو و ئەویش پێی سەیر بوو کە کوڕیژگەیەکی وەکو من سەرنجی زمانەوانیی لەوجۆرەی هەبێت.
دوای ئەوە ناوبەناو لە چایخانەی شەعب و دواتریش بۆ ماوەیەك لە چایخانەی کاروٚخ کە دەکەوتە سەروو مزگەوتی گەورەوە؛ لەگەڵ مامۆستا ڕەووف بێگەرددا دەمبینین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەودەمە ئەوان لە من و هاوڕێکانم هەڵکشاوتر بوون، چ لەڕووی تەمەن و چ وەکو ئەزموون و کەسێتیی ئەدەبییان، بۆیە بواری هاوڕێیەتی و تێکەڵاوبوونمان زۆر سنووردار بوو و مەگەر لە هەندێ بۆنەدا نەبێت.
هەر لە ساڵی ١٩٨١ دا بوو وەختێ لەگەڵ هەندێ هاوڕێی تردا لە شانۆگەریی "ئاسك" دا وەکو ئەکتەر بەشداریمان کرد کە لە دەرهێنانی  هونەرمەندی خوالێخۆشبوو "کەریم عوسمان" بوو. هەڵبەت وەك دەزانن " ئاسك" شانۆنامەیەکی شیعری بوو لە نووسینی شێرکۆ بێکەس. بۆیە ئەمجارەیان وا ڕێکەوت کە ئێوارەیەکیان دوای نمایشەکە؛ هەندێ لەو برادەرانە لەگەڵ کاك شێرکۆ کۆبووینەوە و گفتوگۆمان لەسەر شانۆنامەکە کرد و بیرم دێ من گفتوگۆیەکی زۆرم لەگەڵیدا کرد ودیسانەوە هەندێ سەرنج و تێبینیی خۆمم لەسەر بابەتی شانۆنامەکە و تەکنیکەکەی خستەڕوو و تەنانەت سووکە بەراوردێکم کرد لەگەڵ "لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا" ی "سامۆییل بێکیت" کە ئەوسا بە عەرەبی خوێندبوومەوە.ئەو نکووڵیی لەوە کرد لەژێر کاریگەریی ئەو شانۆنامەیەدا "ئاسك" ی نووسیبێت. هەڵبەت بەراوردەکەی من لەوەوە هاتبوو کە لە شانۆنامەی ئاسکدا؛ ئاسکەکە لە لووتکەیەکی هەزاربەهەزاردا گیر دەخوات و کەس نازانێ ئاخۆ ئاسکەکە دەگەڕێتەوە یان نا. لای بێکیتیش هەموو چاوەڕێی گۆدۆن و کەس نازانێ ئاخۆ ڕۆژێك دێت یان نا. بێگومان من کە ئەمەم بە کاك شێرکۆ وت؛ لە هەمانکاتدا باش دەمزانی کە تێڕوانینی بێکیت زیاتر فەلسەفییە، بەڵام تێڕوانینی ئەو زیاتر مۆرکێکی سیاسیی بەخۆیەوە گرتبوو.
دواتر و بەحوکمی هەلومەرجی سەختی هەشتاکان و پاش چوونی کاك شێرکۆ بۆ شاخ و دواتریش بۆ هەندەران، من جگە لە بەرهەمەکانی چیتر خۆیم نەبینییەوە

تا دوای ڕاپەڕین و لە ١٩٩١ دا هاتەوە و قەسیدەی درێژی ـ دەربەندی پەپوولە ـ ی خوێندەوە. هەر دوای ئەوەش بە ماوەیەك، ڕۆژێکیان هاوڕێیەك داوەتێکی لە بناری گۆیژەدا ساز کرد و ئەوەندەی بە بیرم بێت کاك شێرکۆ و دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و مامۆستا ڕەووف بێگەرد و جەمال غەمبار و عوسمان چێوار و کەمال سابیر و چەند برادەرێکی تر و هەروەها منیش بووین. هەم گفتوگۆمان لەسەر ئەو قەسیدەیەی کرد و، هەم ئەو و دکتۆر عیزەدینیش باسیان لەوە کرد کە بۆ پەرلەمان و یەکەمین کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان پاڵێوراون و ئیتر قسەوباس لەسەر بارودۆخی سیاسیی ئەوسا کرا . ئەوەبوو دواتریش یەکەمین حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا و کاك شێرکۆش بوو بە وەزیری ڕۆشنبیری.

ساڵی ١٩٩٤ بوو ، من لە هەولێر بووم و هێشتا بارودۆخ گرژ نەبووبوو و ئاگری شەڕی ناوخۆ هەڵنەگیرسابوو. ڕۆژێکیان کاك شێرکۆ هەواڵی منی لە برادەرێك پرسیبوو و پێی وتبوو دەمەوێ ببینم و ئیشم پێیەتی. لەڕاستیدا کاتێ ئەو برادەرە هەواڵەکەی دامێ نەمدەزانی ئاخۆ دەبێ ئیشەکەی کاك شێرکۆ چی بێت. بەهەرحاڵ، ژمارەی تەلەفۆنێکی دامێ کە پەیوەندیی پێوە بکەم. بێگومان ئەودەمە هێشتا مۆبایل نەهاتبووە ئاراوە و ژمارەکە هی تەلەفۆنێکی نۆرماڵ بوو. ئەوەبوو من تەلەفۆنم بۆ کرد و وتی حەزدەکەم بتبینم و شتێکت لەگەڵ باس بکەم . بۆ ئەوەش شوێنێکی دیاری کرد تا عەسری ئەو ڕۆژە لەوێ یەکتر ببینین. عەسر چووم بۆ شوێنی دیاریکراو و سەیرم کرد کاك شێرکۆ بەخۆی و جانتاکەی دەستییەوە لەسەر مێزێك دانیشتووە و چاوەڕێی من دەکات. پاش سڵاو و هەواڵپرسین ؛ وتی "خۆت دەزانیت کە لە هەندەرانەوە هاتمەوە قەسیدەیەکی درێژم لەگەڵ خۆمدا هێنایەوە کە ئەویش دەربەندی پەپوولە بوو. من دەمەوێ ئەو قەسیدەیەم تەرجەمە بکرێ بۆ عەرەبی چونکە








له لوبنان بەڵێنیان پێ داوم بۆم چاپ بکەن. بۆ وەرگێڕانەکەشی تۆم هەڵبژاردووە.
لەڕاستیدا سەرەتا کەمێك سڵەمیمەوە. یەکەم لەبەر ئەوەی ئەو دەقە دەقێکی زۆر درێژە و پێشتر ئەزموونی کاری شیعریی درێژی لەوجۆرەم نەبوو. دووەم: لەبەر ئەوەی شیعری شێرکۆ پڕە لە وشە و دەستەواژەی کوردیی ڕەسەن و تایبەت بە زمان و کەلتووری کوردی و وەرگێڕان و دۆزینەوەی هاوواتای عەرەبی بۆیان کارێکی ئاسان نییە. سێیەم : لەبەر ئەوەی وەرگێڕانی شیعر خۆی لەخۆیدا دژوارترین جۆری وەرگێڕانە و تەنانەت گەر وەرگێڕ ڕۆحیش بکات بەبەری وەرگێڕانەکەدا، ئینجا هەر دەقە وەرگێڕدراوەکە نابێتەوە بە دەقە ئەسڵییەکە. هەڵبەتە من ڕام وایە کە ئەوە بەهەڵەداچوونێکی گەورەیە ئێمە داوا لە وەرگێڕی دەقێکی شیعری بکەین کە دەبێ وەرگێڕانەکەی دەقاودەق وەك ئەسڵەکە بێت. ئەمە شتێکە ئەستەمە، چونکە هەر زمانە و ستراکتۆر و تایبەتمەندی و مۆسیقای تایبەت بە خۆی هەیە و لە شیعریشدا تایبەتمەندییەکانی زمان بە ڕادەیەك چڕ دەبنەوە کە تەرجەمەکردنیان وەکو خۆیان بۆ سەر هەر زمانێکی تر کارێکی زەحمەتە. واتە دەقە وەرگێڕدراوەکە ناتوانێ هەڵگری هەمان خەسڵەتەکانی دەقە ئەسڵییەکە بێت، بەڵام دەشێ دەقە وەرگێڕدراوەکە ببێتە دەقێکی شیعریی تری جوان کە هاوتەریبی دەقە ئەسڵییەکە بێت و لە گەلێ ڕووەوە لێی بچێت.

بەهەرحاڵ، من بەڵێنم پێ دا کە کاری تێدا بکەم و وتم هیوادارم وەرگێڕانەکە لە ئاستێکی باشدا بێت. ئیتر ئەوە بوو پاش چەند ڕۆژێك لەو دیدارە، دەستم کرد بە وەرگێڕانی کارەکە.

دەمەوێ لێرەدا ئەوە بڵێم کە دەربەندی پەپوولە یەکەمین قەسیدەی درێژی نوێی کوردییە و بێ دوودڵی دەتوانم بڵێم شاکارێکی شیعرییە و یەکێکە لەو دەقە هەرە جوانانەی شاعیر کە تیایدا هەندێ تەکنیك بەکاردێنێت و لەگەڵ یەکدا لەو دەقەدا تێکەڵیان دەکات کە پێشتر نمونەی نەبووە. ئەمە جگە لەوەی بەکارهێنانی زمان لەم قەسیدەیەدا لە ئاستێکی باڵادایە، چ لە ڕووی ڕەوانی و چ لە ڕووی بەیانکردن و چ لە ڕووی مۆسیقاشەوە. هەر بۆیە تەرجەمەکردنی ئاسان نەبوو.

هەروەکو پێشتریش ئاماژەم پی دا، لەم قەسیدەیەشدا کۆمەڵێك وشە هەبوون کە

دۆزینەوەی هاوتا عەرەبییەکانیان کارێکی سانا نەبوو، بەڵام خۆشەویستیم بۆ قەسیدەکە، هانی دام کارەکە ئەنجام بدەم و گوێ نەدەمە ماندووبوون.

لە وەرگێڕانەکە بوومەوە و دواتر کە هاتمەوە بۆ سلێمانی؛ دەقە وەرگێڕدراوەکەم نارد بۆ کاك شێرکۆ کە ئەوکات لە سوید بوو. ئیتر ئەوەبوو لەساڵی ١٩٩٦ دا لە بەیرووت چاپ کرا و وەختێ کاك شێرکۆ هاتەوە بۆ کوردستان جەند نوسخەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا. شایانی باسە ناونیشانەکەیم بە "مضیق الفراشات" تەرجەمە کردبوو و شاعیری عیراقی "کاظم السماوي"ش پێشەکیی بۆ نووسیبوو.

پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێم کە بۆ وەرگێرانە عەرەبییەکە ناچار بووم لە زۆر شوێندا پەراوێز دابنێم، چونکە وەکو وتم هەندێ وشە هەبوون کە دۆزینەوەی هاوواتا بۆیان لە زمانی عەرەبیدا کارێکی ئاسان نەبوو و، جگە لەوەی ناوی کۆمەڵێك شوێن و کەسێتیی کورد و ڕووداو هەبوون کە پێویستیان بە ناساندن هەبوو بە خوێنەری عەرەب.

جێی ئاماژە بۆ کردنە کە دوای لەچاپدانی دیوانەکە، هەندێ ڕەخنەنووس و نووسەری عەرەب لەسەریان نووسی، لەوانەش ڕەخنەنووسی دیاری عیراقی "یاسین النصیر" کە لە ڕۆژنامەی حەیاتی لەندەنیدا لەسەری نووسی و بە کارێکی جوانی لە قەڵەم دا.




دیوانێکی تری شێرکۆ بێکەس کە داوای لی کردم بۆی تەرجەمە بکەم، کتێبی بۆننامە بوو، کە ئەویش قەسیدەیەکی درێژ بوو.

دەتوانین بڵێین کە ئەم قەسیدەیە سەفەرێکە لەڕێی بۆنەوە، بەناو دنیای شتەکان و ڕووداوەکاندا (بەتایبەتیش شەڕی ناوخۆ). لێرەدا دەمەوێ ئەوە بڵێم کە وەختێ پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم ئەم قەسیدەیەی بۆ تەرجەمە بکەم؛ بە ڕاشکاوییەوە پێم وت کە من لە وەرگێڕانەکەدا هەندێ ڕستە و بڕگە لادەبەم چونکە بە بڕوای من ڕاستەوخۆیی زاڵە بەسەریاندا و مانەوەو نەمانەوەیەن کار





لەسەر شیعرییەتی قەسیدەکە ناکات. ئیتر بەوە قایل بوو و ئەویشم بەناوی "سفر الروائح" ەوە کرد بە عەرەبی و لە سوریا چاپ کرا و شاعیری ناسراوی عەرەب "نزیە ابو عفش" پێشەکییەکی بۆ نووسی. لە وەرگێڕانی ئەم کارەشدا، جگە لەو کێشانەی پێشوو، ڕووبەڕووی کێشەیەکی تر بوومەوە کە ئەویش چەندبارەبوونەوەی وشەی "بۆن" بوو کە ئەمەش لە عەرەبییەکەدا جۆریك لە مەلەلی دروست دەکرد، بۆیە ناچاری کردم هاوواتاکانی بۆن لە زمانی عەرەبیدا بدۆزمەوە و بە گوێرەی گونجان لەجێی خۆیاندا دایانبنێم و بەمجۆرە خۆم لە چەندبارەکردنەوەی وشەی "رائحە" بپارێزم. هەر بۆیە بۆ نموونە پەنام بۆ ئەم هاوواتایانە برد: رائحە، فوح، ضوع، اریج، عبق، عبیر،عطر، شذی.

لەپاڵ ئەم دوو کتێبەدا، ناوبەناو هەندێ لە شیعرە کورتەکانیم وەردەگێڕا و ئەویش یان لە کۆڕ و یاخود لە دیمانەی تەلەفزیۆنیدا دەیخوێندنەوە و یانیش بۆ گۆڤارێکی عەرەبیمان دەنارد و بڵاو دەبۆوە.

بۆ نموونە، جارێکیان هەندێ شیعرم بۆ تەرجەمە کرد و لە بەرنامەی "روافد"ی کەناڵی ئەلعەرەبییەوە خوێندنییەوە. یان چەند جارێك کە ویستوویەتی لە فێستیڤاڵی ئەدەبیدا و بە تایبەتیش فێستیڤاڵی گەلاوێژدا بەشداری بکات، کۆمەڵێك کورتەشیعریم بۆ کردووە بە عەرەبی و خوێندوونیەتییەوە. یەکێك لەو جارانە، ئەو جارە بوو کە شاعیری گەورەی عەرەب "ئەدۆنیس" هات بۆ سلێمانی.

جگە لەوانە، کتێبێکی ترم بە عەرەبی بۆ ئامادە کرد کە بریتی بوو لە وەرگێڕانی هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانی و لەلایەن کۆمەڵێك ئەدیب و وەرگێڕەوە کرابوون. من پیایاندا چوومەوە و دواتر کتێبەکە بە ناوی (انبهارات)ەوە لەلایەن (المرکز القومي للترجمە) ەوە لە قاهیرە چاپ و بڵاو کرایەوە و نزیکەی ٦٠٠ لاپەڕە دەبوو.

* * *

ساڵی ١٩٩٨ بوو ، کاك شێرکۆ دیسانەوە تازە لە سوید گەڕابۆوە بۆ کوردستان، ڕۆژێکیان یەکمان بینی و وتی حەز دەکەم باسی پرۆژەیەکت لەگەڵدا بکەم، کاتێ لێم پرسی چییە، وتی من بیرۆکەی دامەزراندنی دەزگایەکی گەورەی ڕۆشنبیری و چاپ و بڵاوکردنەوەم لا گەڵاڵە بووە و لەگەڵ هەندێ برادەر و نووسەری تردا قسەم

کردووە و بەتەماین داوایەك بۆ وەرگرتنی مۆڵەت بۆ دەزگاکە پێشکەش بە حکومەت بکەین، لەبەر ئەوە دەبێ تۆش لەو دەزگایەدا لەگەڵماندا بیت . ئیتر دوای ئەوەی قسەمان لەسەر ئەوە کرد کە دەزگاکە چۆن بێت و چۆن نەبێت ، من ڕەزامەندیم پیشان دا و ئەوە بوو پاش ماوەیەك و لە کۆتاییەکانی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ دا دەزگاکە بە ڕەسمی دامەزرا و لای فولکەی یەکگرتنەوە خانوویەکی دوونهۆمیمان بۆ بە کرێ گرت و بەناوی "دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم"ەوە دەستمان بە کارەکانمان کرد و ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبان و نووسەران هەم لەوێ کاریان کرد و هەم لە دەوری دەزگاکە کۆبوونەوە .

بەهۆی کارکردنمان پێکەوە لەو دەزگایەدا لەو ساڵە بەدواوە تێکەڵاویمان لەگەڵ کاك شێرکۆ زیاتر بوو، چونکە ڕۆژانە بەرخوردمان لەگەڵ یەکدا هەبوو و لە زۆربەی بۆنە ڕۆشنبیرییەکانیشدا پیکەوە دەبووین. ڕەنگە ساڵانی پێکەوەکارکردنمان لە سەردەم ، چ لەگەڵ ئەو و چ لەگەڵ برادەرانی تردا پێویستی بە باسێکی سەربەخۆ بێت، بۆیە ئەوە هەڵدەگرین بۆ دەرفەتێکی تر.بەڵام دەمەوێ ئەوە بڵێم کە کاك شێرکۆ خوێنەرێکی باشی دنیای ئەدەب بوو و بەتایبەتیش ڕۆمان و بایۆگرافی.ئەو تا ماوەیەکی کەم بەر لە دوا گەڕانەوەشی بۆ سوید و کۆچی یەکجارەکیی، بەردەوام سەرقاڵی خوێندنەوە بوو، یانیش سەرقاڵی شیعریکی نوێی بوو. گەلێ جار کە دەچووم بۆ لای دواشیعری خۆی بۆ دەخوێندمەوە، وەکچۆن بەشێك لەو شیعرەی بۆ خوێندمەوە کە بۆ کەرکوك نووسیبووی و مەرگ ڕێی پێ نەدا تەواوی بکات. جاری واش بوو کاتێ قەسیدەیەکی درێژی دەنووسی، من و ڕەووف بێگەرد و شێرزاد حەسەن و جاری وابوو یەك دوو برادەری تریشی بۆ ماڵی خۆیان بانگ دەکرد و بۆی دەخوێنینەوە و حەزی دەکرد گوێی لە سەرنج و تێبینییەکانمان بێت.

لەڕاستیدا شیعر لای شێرکۆ بووبوو بە جۆرێك لە پیشە، یان چاکتر وایە بڵێین بووبوو بە ئەفسوونبازی شیعر. هێندە بەس بوو ڕووداوێك، چرکەساتێکی دڵتەزێن، جوانییەك، سەرنجی ڕابکێشێت و دوای ڕۆژێك بیکات بە شیعرێکی جوان.

زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێین بە دواکۆچی شێرکۆ، شیعری کوردی گورزێکی توندی بەرکەوت و زۆری دەوێت تا شیعری کوردی قەڵەمێکی شیعریی بەبڕشت و داهێنەر و نەفەس درێژی وەکو ئەوی تیا هەڵبکەوێتەوە.

٢٠١٤/٧/١٥



# باجی شەڤیقە

ئیدریس عەلی

به سواری پاسکیلێکی سێ تایی

که له ئاودانی باخی میر هاتەوه

که نەختێك گەورەبوو و

لەخەمی نیشتمان رەخسی

که چاوی شیعری کردەوه و

یەکەم پێکی

به یەکەم جگەرەوە نووسی و
دڵی لە دواین نامەدا شکا،
ئیتر گوڵ و
خەم و
کۆتر و
عەترەکانی دەپێچێتەوە،
بە ڕێگەی قاچاخدا
لەپشت بازگەکانەوە
لەگەڵ کۆڵبەرە غەمگینەکان
بەناو باخە مینڕێژکراوەکاندا
بەخێرایی پاسکیلەکەی دەئاژوێ و
" دوای بانگی برینمان" دەگاتە جێ،
دەگاتە بەردەرگای هاوارمان
هاوار لە قوڕگمان دا دەبێت بە کۆتر،
خۆی دەکات بە هەیوانی گریانمان دا
فرمێسك لە چاوانمان دەبیت بە پەپوولە،
بە تیلەی خەم
لەسەر نوکی خەیاڵ
بە کۆڵانی تەنگ و تاریکمان دا دەگەڕێ
حەوشەمان... پڕ دەبێت لە گوڵی پەمەیی

ئەدەبی بەردەم ٧٩

مالّمان... پڕدەبێت لە باقوبریقی شیعر
ئەوینمان.. پڕدەبێت لە جریوە جریوی جوانیی
شۆڕشمان... پڕدەبێت لە گوڵدانی بڕوا
کێڵگەمان... پڕدەبێت لە شەتڵی ئومێد
ئاسمانمان... پڕدەبێت لە چۆلەکەی بزێو.
بەسواری پاسکیلێکی سێ تایی
لە کۆڵانی قیژەوە دیتەدەر
بە جادەی برینا هەڵدەگەڕێ
ئیستۆپێك و لە بەردەم
چاخانەی کەپرەکەدا دەوەستێ
زنجیری پاڵتۆکەی دەکاتەوە
باران لە ئازای ئەنامی دەچۆڕێت
گوڵ و کۆتر و
عەترەکانی دادەگرێت،
بەسەر پێوە چایەك
بە بزەیەکی شیرینەوە هەڵدەقوڕێنێت
ئیتر دەزانین پەلەیەتی
زوو بگاتە " گۆڕستانی چراکان،"
لەوێ لەکەرکووك
پاسکیلەکەی جێدەهێڵێت



تایەکانی پەنچەربوون
ئیتر یەك پایدەری تر نارۆن...!
* * *
پاییز نەبوو
ئێمەش وەك تۆ
مۆمی قەسیدەیەکمان
دێڕ.. دێڕ کوژایەوە
کتێبێکمان
پەڕە.. پەڕە سەفەری کرد،
شەو نەبوو
ئێمەش وەك تۆ
دارستانێکمان گەڵا
بە درەختیەوە نەما
لەو نەختە ئەسمانەی ژوورسەرمانەوە
جریوەی ئەستێرەیەك نەهات
ئیتر چۆڕێ تریفە
بە دەستی مانگەوە
نەتکایە زاری شەویکمان
لە دەربەندی ڕۆحماندا
شوێن پێی پەپولەیەك نەڕوا



ئیتر بۆ ئەبەد
کچێك نەبووە نیشتمانمان،
باجی شەفیقە
ئێمەش وەك تۆ
قەڵەمێکمان کۆچێکی  نووسییەوە
سوور سوور
چرایەك لە دڵماندا کوژایەوە
ڕوون ڕوون،
ئێمەش وەك تۆ
زوقم دای لە ئینجانەکانمان و
ئیتر خەونێکمان سەوز نەبوو،
گوڵدانەکانمان دایانە زریکە و
شیعرێك نەبوو ئاوازێك بکات بە دەمیانەوە،
دادە شەفیقە.. تۆ ئەو ئێوارە لێرە نەبوویت
چۆلەکەکانمان بە پرتاو
بە دڵی شکاوەوە
وەك ئەوەی ئەستێرە ڕووخابێ بەسەریانا
بە گیانی ئارەقاوییەوە
خۆیان کردەوە بە ناو هێلانەکانا و
یەکبەیەك لەبەینی خۆیاندا دەیانجریوان:

ئیتر کێ عوودی جریوەمان بۆ بژەنێت؟
ئیتر کێ فڕینمان شیعراوی بکات؟.
ئێمەش دەمانزانی.. باجی شەفیقە
دەمانزانی
نەدەبوو بارانی ئەم هاوینە
لەناکاو خۆشکاتەوە،
دەمانزانی نەدەبوو
ئەم ئاوە سازگارە
ئەم شنە ئارامە
سەر داخات و بێ خەم
بەلای ڕێحانەکانا تێپەڕێت..
پەلەی چی بوو باجی شەفیقە
کوڕەکەی تۆ کاك شێرکۆ
پەلەی چیبوو
لە پێچانەوەی جانتای خەمی؟
لە کوژانەوەی جگەرەی شیعری؟
لە پێوەدانی دەرگەی دەنگی؟
لە دادانەوەی پەردەی چاوی؟
لە بەخشینی ملپێچە سوورەکەی بە هەڵەبجە ؟
لە ناردنی عەینەکەکەی بۆ گەرمیان؟



له چوونی بۆ کەرکووك
بە سواری پاسکیلێکی سێ تایی
تا لەوێ تایەکانی پەنچەربن و
ئیتر یەك پایدەر ڕێ نەکەن؟
پەلەی چیبوو کورەکەت
دادە شەفیقە
کاك شێرکۆ دەڵێم.. گویت لێمە؟
کورەکەت پەلەی چیبوو؟



# ڕەسووڵ یۆنان

## شاعیر و چیرۆکنووسی بەناوبانگی ئێران

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی: بابەک سەحرانەوەرد**

# شێرکۆ بێکەس شاعیری ژیان و ئازادی بوو

ڕەسووڵ یوونان چالاکەڤانی بواری ئەدەب و شیعری هاوچەرخی فارسییە و تا ئێستا زیاد لە بیست کتێبی لە ئێران و دەرەوەی ئێران چاپ کردووە، لە فیلم و سینەمایش گەلێك چالاکە و هەنووکە لەم بوارانە خاوەن بیروبۆچوونە و بە کەسایەتییەکی بە دەنگ و ناوازە دەژمێردرێت.



ئەم شاعیرە توورکە کە بە زمانی فارسی و توورکی بەرهەمەکانی لە ئێران لە چاپ داوە دەربارەی شێرکۆ بێکەس ئەڵێت:

من لەگەڵ شیعری کوردی لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە تا ڕادەیەك ئاشناییم پەیداکرد. ئەم شیعرە"کوردی" نوێنەری بەرفراوانی هەیە. بە حورمەت و ڕێزی زۆر لە عەبدوڵڵا پەشێو، لەتیف هەڵمەت، هەژار موکریانی، فەرهاد پیربال، من شێرکۆ بێکەسم زیاتر لەوانەی دی خۆشدەوێ . ڕاستە یەکەمین شاعیری کورد کە من ئاشنابووم پێی عەبدولڵا پەشێو بوو، بەڵام شیعری شێرکۆ بەڕای من تایبەتمەندیگەلی فرە زۆرتری بە نیسبەت شاعیرانی هاوجیلی هەیە. شێرکۆ بێکەس سەرەڕای پێگە بەرزەکەی، شاعێرێکی سانا، هاودڵ و خەمخۆرە. شێرکۆ، ژیان و ئازادی و چەرمەسەری و نەهامەتییەکانی مرۆی لە پشت وشەکان نەشاردۆتەوە، بەڵکوو ئەم چەمکانەی لە پشت وشەکان دەرهێناوە و ئەوانەی لە بەرانبەر بەردەنگەکانی خۆی بە شێوەیەکی لێهاتوو و پسپۆڕانەشی کردۆتەوە. بێکەس، شاعیری ژیان و ئازادییە و دژی ئەم بیرەم کە بە مەرگی ئەو هەر زوو لەزەین و یادی خەڵکان بڕوات و فەرامۆش بکرێت و ئیدی چ کەسێك ئاوڕ لە کەسێتیی و شیعرەکەی نەداتەوە.

مرۆڤێك کە لە شیعری شێرکۆ بوونی هەیە و هەناسە دەکێشێ و گیانی تیادایە، هەر چەند جلوبەرگی کوردیی لەبەردایە، بەڵام مرۆڤێکی جیهانییە. شێرکۆ لە بەستێنی هەرامە و شتەکان و سنوورەکان سکاڵای بوو و قەت مرۆڤەکەی لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا دانەتاشیوە و بەڕای من هەر بەم هۆکارەیە کە شیعرەکەی جیهانییە، واتە هەر کەس شیعرەکەی بخوێنێتەوە دەشێ خۆی لە نێوان وشەکانیدا بدۆزێتەوە.

شێرکۆ بێکەس یەکێکە لە ناوە هەرە گەورەکانی شیعری ئیمرۆی جیهان. هیچ کەسێکش نییە جێگەی پڕکاتەوە. هەڵبەت زۆرن ئەوانەی شێرکۆ بە شاعیرێکی سرووشتخواز دەژمێرن، بەڵام من پێم وانییە و پێم خۆش نییە شێرکۆ لە بەستێنی ئەم وشەگەلە پێناسە بکەم و نزمی بکەمەوە. لە شیعری شێرکۆ، پیشەسازی، نەخۆشی، تووڕەیی و دەمارگرژی، بەستێنەکان و چەندها شتی دیکە دەبیندرێ و تیشکی خستۆتە سەر زەینی خوێنەر. لەولایشەوە شێرکۆ قەت خاوەن ڕوانگەیەکی تاك ڕەهەندی لەبەرانبەر مرۆڤ و جیهاندا نەبووە. خاڵێکی گرینگ کە هەر ئێستا بەزەینم ختوورەی کرد ئەمەیە کە بەداخەوە مردنیش یەکێکە لە حیکایەتە دڵپەرۆشەکانی ژیان.



# سەید عەلی ساڵحی

## شاعیری گەورەی ئێران

ساڵحی کە ئەرکی دووبارەبێژی و دووبارەدارێژی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسی بۆ یەکەمجار لە ئێران وەك شاعیرێکی دەنگ و پرۆفیشناڵ لەئەستۆ گرتووە، لەمەڕ ئەم کەڵە شاعیرە ئەڵێت:

شێرکۆ بێکەس بۆ من هەڵگری بایەخ و نرخێکی تایبەتە. هۆگریی من بەم شاعیرە لە چەشنی هۆگری من بۆ یانیس ریتسۆس، پابلۆ نێرۆدا، نازم حیکمەت، گارسیا لۆرکا، مەحموود دەرویش، ئەحمەد شاملوو شاعیرانێکی پێشەنگ و پێشڕەو کە لەلای من سەر چەشن بوون، بەتایبەت لە پاراستنی دەربەستی بۆ مرۆڤ. روانین و نیگای شێرکۆ بۆ کۆی چارەنووسی مرۆ بەمانا مێژووییەکەی و بەواتای بوونەوەرێك کە بە شێوەی رامیاری تێدەفکرێ، زۆر بۆ من بایەخدار و گرینگ بووە. شیعری پاستۆڕاڵ، شیعری شوانی، شیعری





سرووشتیی ئازاد و شیعری کۆمەڵگەی کراوە بە چەشنێك بوو کە منی دەخستەوە یادی ڕەگ و ریشەکانی خۆمەوە. شێرکۆ لەواقیعدا یەکێکە لە شاعیرە بەرزەکانی قاڕڕەی ئاسیا و بەردەوام بۆ من بایەخێکی تایبەتیی بووە.

من و شێرکۆ بێکەس نزیکایەتییەکی تایبەتیی مێژووییمان هەیە. زێتر لە **26** ساڵ لەمەوبەر بۆ یەکەمجار شیعری شێرکۆم لە ئێران ناساند. ئەو کەسانە کە کەم تاکورت بە هۆنراوەکانی شێرکۆ ئاشنا بوون دەیانگووت کە شێرکۆ شاعیرێکی بەنرخ و بە قووەتە، بەڵام شێعرەکانی بەشیاوی وەرنەگێڕدراوە و ئێستاکە دەتوانین هێز و تینی شیعرەکانی ببینین.

شێرکۆ لەگەڵ شیعری مۆدێرنی سەد ساڵەی ئێران ئاشنایەتییەکی باشی بوو. شێرکۆ پانزدە ساڵ لەمەوبەر بۆ تاران هات و لە نزیکەوە یەکترمان بینی. منیش تاسەی بینینی ئەم کەڵە شاعیرەم دەکرد. هەر دەڵێی لە زووگینەوە هاوڕێ و برادەری یەك بووین. شێرکۆ لە پاڵ هۆنینەوەی شیعر، لەولایشەوە زۆری دەخوێندەوە و زۆر سەرنجی شتی دەدا.

ساڵحی پشتی بەم ڕایە بەستووە کە دیاردەگەلی فرەزۆر دەبێ بێنە ئاراوە هەتا هەلومەرجێکی تایبەت بۆ شاعیرێك بڕەخسێ کە ببێتە شاعیرێکی جیهانیی. ساڵحی هەروەتر وتی کە ئێستا لە ئێران ئێمە شاعیری گەورەمان زۆرە، بەڵام هەلومەرجیێکی تایبەتی پێویستە و نەمانتوانیوە بەو چەمکە ئێمڕۆییە شاعیرێکی جیهانیمان ببێت.

شێرکۆ لە پاڵ نازم حیکمەت و مەحموود دەرویش راوەستاوە و ئەمە نیشانەگەلێکن کە نیگای میدیاکان و راگەیاندنە جیهانییەکان بەلای نووسەر و شاعیراندا ڕادەکێشێ. ئینجا ئەو شاعیرە بەناوبانگ دەبێ و بۆ ئەم جیهانیبوونە دیارە وەرگێڕان وەك یەکەم هەنگاوی جیددی، کارێکی گرینگە و رۆڵێکی تایبەتیی دەگێڕێ و ئەو شاعیرە وەك ڕوویەك لە ڕووپەڕی جیهاندا دێتەئاراوە و دەدرەوشێتەوە و ئینجا لە جیهاندا ناودار دەبێت.

# فریشته ساری

## رۆماننوسی گەورەی ئێران





خاتوو فریشتە ساری رۆمان نووسی بەتوانای ئێران لەمەڕ شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس ئەڵێ:

یەکەمجار کە هەندێك لە شیعرەکانی شێرکۆم لەملاولا خوێندبووەوە وا هەستم دەکرد لەبەرانبەر شاعێرێکی ئاسایی و سانادام. بەڵام دوا وەرگێڕان




و دووبارەبێژی شیعرەکانی ئەم شاعیرە لەلایەن سەید عەلی ساڵحی و بابەك سەحرانەوەرد کە چەند ساڵ بەر لە مەرگی شێرکۆ لەملاولا بەگوێم گەیشتبوو، لەسەر ئەم هەڵوەستە سوور بووم کە شێرکۆ بێکەس یەکێکە لە ڕووە گەشەکانی جیهانی شیعر و هەست و خەیاڵ و بەپێزوهێزترین شاعیری کوردستانە.

بەڕاستی کە شێرکۆ بێکەس لەسەرووی هەموو ئەو بانگەشە و پێداهەڵگوتنەیە کە بۆی کراوە و ئێستاکەش هەر بۆی دەکەن.

ڕۆحی شاد.



# فەرزانە قەوامی

خاتوو فەرزانە قەوامی کە خاوەن چەندین کتێبی شیعرە و لەم بوارەدا لە کەسێتییە ناودارەکانی شیعری ژنان لە ئێران دێتەژمار و هونراوەکانی بەردەوام وەك شاعیرێکی پرۆفیشناڵ بوونەتە جێگەی باس و خواس و تێڕامان، لەمەڕ شێرکۆ و شیعرەکەی ئەڵێ:

من لەگەڵ شیعری کوردی زۆرتر بەو وەرگێڕانە کە لە شیعری کوردی کراوە،



ئاشنایەتیم هەیە لێ کوردی نازانم. هەر بەم هۆیە بووە کە وەرگێڕانی شیعری شاعیرە کوردەکانم خوێندۆتەوە. لەگەڵ شیعری بێکەس و هەندێکی تر لە شاعیرە کوردەکان تا رادەیەك ئاشنایەتیم هەیە.
نیگا قووڵەکەی شێرکۆ بۆ ژیان و مرۆڤایەتی لە دیاردە تایبەتییەکانی شیعری شێرکۆیە کە ئەوی کردووە بە شاعیرێکی خاوەن ڕا و دەنگ. لە هۆنراوەکانی شێرکۆدا ئێمە لەگەڵ شاعیرێك بەرانبەر دەبین کە حەزێکی هەمیشەیی بە رەمز کردنەوە لە دڵیدا شاردۆتەوە. ئەو لە شێعرەکانیدا لە توخمگەلی سرووشت ئیلهام وەردەگرێ بەڵام کارە تایبەتییەکەی شێرکۆ لە بەستێنیی ئەم توخمگەلە نامێنێتەوە. ئەو بە تێڕامان و تێڕوانینی تایبەتی خۆی بە جیهانێکی جیاواز مانای نوێ دەبەخشێت. لە زەینی شێرکۆ دیاردەکان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدیدا بە ژینێکی جیاواز دەگەن. لەوێدایە کە لە ئەڤین، تەنیایی، ئاوارەیی، مەرگ و ژیان ورد دەبێتەوە و لێیان ئەدوێ و بێ گومان بە نیگایەکی تازە دەس بەکاری ئافراندنی ئەم چەمکانە دەبێ.
شیعری شێرکۆ بەهۆی ناوەرۆکی ئینسانی و مرۆڤخوازانە و نیگا ئازادیخوازانەکەی دەتوانێ لە ڕیزی شاعیرە بێ سنوور و دانسقەکان بێتەژمار بەڵام لەهەمان کاتدا لە تاقمێك لە شیعرەکانی شێرکۆ، خۆشویستنی نیشتمان هەرە بە پێزوهێز هاتۆتەئاراوە و بەرجەستە بووە.
ئەگەرە کو جیهانیبوون بەچەشنێکی دیکەی خۆماڵی بوون بزانین، واتە پێداگری لەسەر شوناسی خۆمان و دەنگدانەوەی جیاوازییەکان و هاوتاکان ـ بەڵێ، شیعری شێرکۆ بەتەواوی دیاردە خۆماڵییەکانی خۆی، چوارچێوە پەراوێزییەکان وەلادەخات و ڕوو لە روانگەیەکی جیهانیی دەکات. شێرکۆ بە شوناسی خۆی ژیان دەکا و شوناسی ئەو لە کوردستان خۆی بەرجەستە دەکاتەوە. لێرەدا شێرکۆ بە



گێڕانەوەیەکی تازەتر لە مرۆڤ دەگات و لەم نێوانە نەتەوەخوازی ئەو لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا دەنگ دەداتەوە. لەڕوانگەی شێرکۆ کوردستان نیشتمانێکی دانسقە و بێ وێنەیە. جێگەیەك کە کڵۆڵیی و چەرمەسەری هەرە زۆری بەخۆوە بینیوە. شێرکۆ قەت ناتوانێ ئەو ئەڤینە قووڵەی خۆی بۆ کوردستان لەبیر خۆی بباتەوە . ئەو بە زمانێکی تایبەتیی لە هۆنراوەکانیدا ، بەردەنگ و خوێنەر لەگەڵ خۆی دەبا، دەڵێی کوردستان نیشتمانی هەموو داژدارانی شیعرەکەیەتی. هەندێکجار کاتێك شیعرەکانی دەخوێنمەوە لەگەڵ خۆم وابیردەکەم کە ئەگەر بێین و ناوی شار و جێگەکان بسڕین و ناوی دیکەیان بۆ دابین بکەین، چ ڕوو دەدا؟ هەمدیس ئەندێشە و ناوەڕۆك لەگەڵ زمانە جوان و کەشخەکەی شێرکۆ، نیشتمانێکی جوانمان بۆ دەخولقێنێت.

شیعری شێرکۆ ئاوێتەیەك لە فۆڕم و ستایل و ناوەڕۆکە.



هەرئەوندە کە زمان لە شیعری شێرکۆ گرینگایەتیی هەیە، لەولایشەوە ئەندێشەخوازی، وەك تەوەرە سەرەکییەکەی هونراوەکانی ئەو دێتە ئەژمار. لە ڕوانگەی فیکرییەوە، شیعری شێرکۆ شیعرێکی مۆدێرنە، لێ لە کێشەکانی ئەمڕۆی مرۆڤ ورد دەبێتەوە. شێرکۆ لە هونراوەکانی چەمکگەلێك وەك مرۆڤ، ئەڤین، نیشتمان و ئازادی دووپات دەکاتەوە. لەجیهانی زەینی ئەم شاعیرەدا، مرۆڤ و سرووشت چەمکێکی بایەخداریان هەیە. ئەزموونی جوانناسانەی شێرکۆ زایەڵەی جیهانێکە کە هەموو رۆژێك لەگەڵ خۆیدا ئاشت دەبێتەوە و رۆح سوکانە وشەگەل دەبەخشێ و ئاسمانیش لە شیعرەکانیدا تیشك دەدا و ڕوون دەبێتەوە .

زۆربەی خوێنەرە ئێرانییەکان بەهۆی پاچڤە، لەگەڵ هونراوەکانی شێرکۆ ئاشنابوون. کەواتە ڕۆڵی وەرگێڕە بەتواناکان لێرەدایە کە خۆی بەتەواوەتی نیشان دەدات. ئەگەر شیعرەکانی شێرکۆ بە وەرگێڕانێکی خاوێن و بەپێزوهێز بناسرێ، بەردەنگە فارسەکان لە شیعری شاعیرە کوردەکان پێشوازی دەکەن و تەنانەت پەسەندیشی دەکەن. بە بەختەوەری هەندێك وەرگێڕ بە زمانی فارسی ئاشنایەتییەکی قووڵ و باشیان هەیە و بەسەر کونج و قوژبنی ئەم ئەدەب و زمانە فرەرەهەندە و پڕپێچ و پەنایە



زاڵن و توانیویانە گەلێك بەكەشخەیی و لێهاتووییەوە شیعری كوردی بۆ زمانی فارسی وەرگێڕن. بەڕای من هۆكاری كەشخەبوونی شیعری شێركۆ بۆ گەنجە ئێرانییەكان بەهۆی هەبوونی ئەڤین و ئارمانە مرۆڤایەتییەكانە كە هەمیشە لە ناخی شیعرەكانی شێركۆدا جێگەیەكی تایبەتییان داگیركردووە و ئەمانە بووەنەتە هۆی پەیوەندیی خوێنەری فارس لەگەڵ شیعرەكانی شێركۆی نەمردا.



# دوکتۆر قوتبەدین سادقی

## نووسەر و شانۆکار

دکتۆر قوتبەدین سادقی یان هەرواکە لەلای کوردەکان بە دکتۆر قوتبە ناسراوە، شانۆنامەنووس و دەرهێنەری گەورەی شانۆیە و خولی دکتۆراکەی لە زانستگا سوربونی فەڕەنسا وەرگرتووە و لە ئێران لە ریزی پێنج کەسێتیی هەرە بەناوبانگیی شانۆ دێتەژمار و خاوەن **40** بەرهەمی ناوازەی شانۆییە، لەبارەی ئاشنایی خۆی لەگەڵ شێرکۆ بێکەس و شیعری شێرکۆ کەوتە قسە و وتی:





بۆ یەکەمجار دەنگیی شێرکۆم بە شیعرخوێندنە حەشرەکەی لە رادیۆی راپەڕینی کوردستانی باشوور لە ساڵی **1974** ئەو کاتە مەلا مستەفا بارزانی دژی ڕژیمی بەعس شەڕی دەسپێکردبوو بیست، بەبێ ئەوەی بزانم ئەم شاعیرە کێیە یاخود ناوی چییە. لەبیرمە یەکەمجار کە بەناوی شێرکۆ ئاشنا بووم، ساڵی **1976** لە زاری دوکتۆر شەهیدی بوو کە ئەو کاتە لە زانستگای سوربونی پاریس وانەی ئەدەب و زمانی کوردیی دەوتەوە، و دواتر لەکاتی خوێندنەوەی شانۆنامەکانی "کاوە" و "ئاسك" بوو کە ناوی شێرکۆم هەمدیسان بیستەوە. لەو کاتەوە بوو کە دەستم کرد بە فێربوون و خوێندنەوەی بەرهەمە کوردییەکان.

دوای ماوەیەك بەخویندنەوەی نامیلکە شیعری "تریفەی هەڵبەست" ئەم جارە زێتر و بەچڕوپڕییەوە لەجیهانە شاعیرانەکەی شێرکۆ وردبوومەوە. ئینجا لەکاتی ڕاپەڕینی ئێران یەکەمین وەرگێڕانەکانی شیعری شێرکۆم لەلایەن هاوڕێ شاعیرکەم واتە جەلال مەلەکشا خوێندەوە. تەنانەت ئاشنایی من بە شیعری پەشێو، رەفیق سابیر و لەتیف هەڵمەت بە هۆی ئاشنابوونم بوو بە شیعری شێرکۆ بێکەس.

شێرکۆ بێکەس مزگێنیدەری ئەڤین و ئازادی کوردستان لە سەردەمی دەمارگرژییە رەگەزییەکان و جینۆسایدی بەعسییەکان بوو. شێرکۆ لەو باوەڕەدابوو کە هونەری ئاگا و وشیار هونەرێکی رەخنەگر و بەرهەڵستە و لە دەسەڵات جیایە و هونەرمەند دەبێ خۆی لە دەسەڵات جیا بکاتەوە و خۆی لەهەموو لایەنە سیاسییەکان قوتار بکات.



# مووسا بیدەج

## شاعیر و وەرگێڕ

مووسا بیدەج لە دایکبووی ئێرانە و زیاتر لە چل ساڵە لە بواری شیعر و وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ عەرەبی و بە پێچەوانەوە چالاکە و تائێستا چەندین کتێبی بە پێزو هێزی لەم دوو دەڤەرە بڵاوکردۆتەوە. بیدەج شێرکۆ بێکەسی بە شاعیرێکی جیهانیی ناودێرکرد کە توانیوەتی لە کولتووره بیانییەکان جێگەی خۆی





بکاتەوە. بیدەج لەو بڕوایەدایە کە کەس ناتوانێت جێگەی ئەم شاعیرە بەرزە پڕبکاتەوە.
مووسا بیدەج کە شاعیر و وەرگێڕێکی شارەزا و بەتوانای ئەدەبی فارس و عەرەبە ئەڵێ:

من لە شەستەکانی هەتاوی هەندێك لە بەرهەمەکانی شێرکۆ بێکەسم وەرگێڕا و لە گۆڤاری "کەیهانی فەرهەنگی" و گۆڤاری "ئەدەبستان" و رۆژنامەی "ئیتلاعات"دا بڵاوم کردنەوە. چوونکە هەرە خوازیاری شیعرەکانی شێرکۆ بووم. بەڕای من شێرکۆ شاعێرێکی جیهانییە و سەرەڕای حەزێکی فرە زۆر بە شیعرەکەی، هەستم دەکرد داژدارانی شیعری جیهان و شیعری رۆژهەڵاتیش شیعری شێرکۆیان فرە خۆش دەوێت.
دواتر کتێبەکانی شێرکۆم بە فارسی وەرگێڕا و وا ڕێکەوت دوو جار شێرکۆ لە نزیکەوە لە فستیڤاڵی گەلاوێژ لە سلێمانی ببینم. لەگەڵیدا کەوتمە ئاخافتن و لەنزیکەوە لەگەڵیدا ئاشنا بووم و خۆشمویست. بە شێرکۆم وت لە ئێران فرە بەناوبانگیت. شێرکۆ پێی وتم کە دەزانێت کتێبەکانی لە ئێران تەرجەمە بوون، بەڵام لە وەرگێڕانی شیعرەکانی کە لەلایەن چەند وەرگێڕی نەزان بە فارسی ئەنجامدراوە، ڕازی نییە. لە وڵامی شێرکۆدا منیش وتم: ئەمن رەخنەکار نیم و نازانم وەرگێڕانی شیعرەکانی ئێوە چۆن چۆنی بووە و ئەگەر کەموکوڕیشی تێدابووە، لانیکەم بوونەتە هۆی ناوازەبوونی ئێوە لە ئێران و لەولایشەوە کتێبەکانتان خوێنەری بۆ پەیدابووە.
بەڕای من شێرکۆ شاعیرێکی جیهانییە. هەرچەند زمانی کوردی لە روانگەی جوگرافیاییەوە بەرتەسك و سنووردارە و بەجۆرێ لەجۆران لە کەمینەدایە، بەڵام شیعری شێرکۆ خوێنەری هەیە و شیعرەکانی بە زمانە بیانییەکان تەرجومە کراون.

بەڕای من  کۆچی دوایی شێرکۆ زیانێکی هەرە گەورەیە، لێ ئەم زمانگەلە لەگەڵ یەکدیدا هەڵسوکەوتی سۆزمەندانە و هەستیارانەی ڕەخساندووە و لەولایشەوە هەڵسوکەوتێکی زمانەوانی و ڕێنووسی چێکردووە. لەروانگەی منەوە، ئەسکەملی شێرکۆ دوای کۆچە خەمبارەکەی بەتاڵ بووە و چ کەسێك ئەو بڕستەی تێدا نییە لەسەری دابنیشێت و جێگەی بگرێت، هەر چەند لە کوردستانی باشوور شاعیری خاوەن ئەزموون و گەورەمان هەیە، بەڵام هەرواکە مەحموود دەرویش گەورەترین شاعیری فەڵەستینە، شێرکۆیش شاعیرە گەورەکەی کوردستانی باشوورە و هەموان لەسەر ئەم بیروڕایە کۆکن.

ئاستی شیعریی شاعیران لەگەڵ یەکدی جیاوازە. پەیوەندیی شیعری شێرکۆ فرە بووە و توانیویەتی لە کولتوورەکانی دیکەدا جێگەی خۆی بکاتەوە و سەقامگیر بێت. دیارە تایبەتمەندیی شێرکۆ بێ نموونە و دانسقەیە کە ئەم تایبەتمەندیگەلە لەشیعری کوردیدا هەرە ڕوون و دیارە. شیعری کوردی تێکەڵی سرووشت و ژیان بووە. بێکەس لە شیعرەکانی باسی هەموو شتێکی کردووە، بێ گیان و گیاندار و راشکاوانە بەم شتانە کەسێتیی بەخشیوە و بوونەتە هۆی ئەوەی لەپاڵ یەکدی و بە پشتیوانی ئەوانە فەزایەکی خەیاڵی و بەڵگەدار بڕەخسێنێت. شتێك کە مرۆڤەکان لەگەڵیاندا گیرۆدە بوون و پێیان خۆشە بیانبێت. شێرکۆ لە هەموو شتێك ژیان دەخولقێنێ، دار دێتە ئاخافتن، باران گۆرانی دەچڕێ، پاساری ئەڤیندار دەبێ. شێرکۆ بە هەموو جیهان تایبەتمەندیی مرۆیی دەبەخشێت و ئەم جۆر شیعرە لە جیهاندا خوازیاری هەرە زۆری هەیە. شێرکۆ خوێنەوارێکی باشی کولتووری کورد و کولتووره بیانییەکان بووە و لە هەموویان زۆریش ورد دەبووەوە.

لە شیعری شێرکۆدا ئەفسانە، حیکایەت، ئوستوورە، مێژوو، خەیاڵ و فانتازیا و شیعر بەردەوام بوونی هەیە و ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی کە خوێندنەوەی شیعری شێرکۆ هەستێکی مرۆیی و سۆزمەندانە لە ناخی ئێمەدا بخولقێنێت.





# د. میر جەلالەدین کەزازی

## مامۆستای زمان و ئەدەبی فارسی، نووسەر و شاعیر

دکتۆر میرجەلالەدین کەزازی کە یەکێکە لە چوار مامۆستای هەرە بەناوبانگی ئەدەب و زمانی فارسیی ئێران، لەمەڕ شێرکۆ و شیعرەکەی ئەڵێ:

لە هەر کوێ کوردەکان هەبن، دلۆڤانی، سەربەستی و پیاوەتیش بوونی هەیە، جیا لە تەواوی ئەمانە، هەر کاتێ ئێمە کوردێك بە جلوبەرگە خۆماڵییەکەی دەبینین و ئەو قسە خۆشانە کە لەزاری دێتەدەر و هەموو هەڵسوکەوتی، تەواوی





ئەمانە بە قەد قووڵایی مێژوو و کولتووری ئێرانە. بەڕاستی کوردستان درگانەی مێژووە کە ئەگەر هەر کەسێك لەم درگانە تێپەڕێ، بۆ نیشتمانی باوباپیرانی خۆی دەگەڕێتەوە. یەکێك لە داخە گەورەکانی من ئەوەیە کە زۆر بە ناخی هەڵبەست و سترانەکانی ئەم شاعیرە پایەبەرزە شێرکۆ بێکەس نەچوومەتەوە هەتا بمەوێ لەمەڕ ئەو بە چەشنێکی هەمەلایەنە بدوێم، بەڵام دەزانم ئەم شاعیرە یەکێکە لە کەڵە شاعیرانی زمانی کوردی. دوکتۆر کەزازی لەو بڕوایەدایە کە جێگەی سەرسووڕماوی نییە لە داوێنە ڕەنگاوڕەنگەکەی ئەدەبی کوردی ڕۆڵەیەکی وەها بەناوبانگ بکەوێتەوە و بۆ هەموو کوردێك ببێتە جێگەی فەخر و شانازی.

بەڕای من شێرکۆ بێکەس مەولەوی کوردەکانە.



# مەحموود مۆتەقیدی

## شاعیر و رەخنەگر

ڕێزدار مەحموود مۆتەقیدی کە شاعیرێکی خاوەن ئەزموون و بەناوبانگە، لەمەڕ شیعری شێرکۆ ئەڵێ:

بێ گومان ئەدەب و مۆسیقا لە کوردستانی رۆژهەڵات و باشوور خاوەن بنچینە و کۆنەساڵییەکی درێژخایەن و هەروەتر خاوەنی مێژوو لە دەقەری کولتوور و زمان و زۆربەی واقیع و ڕاستییەکانی ژیانی




خەڵکییە کە لە درێژایی مێژوودا لەگەڵ سرووشت و هەستی بەتین و عاتیفەی مرۆ بە زۆری هاوشان بووە. لەم بوارەدا شێرکۆ بێکەس وەك جیددی ترین و بەناوبانگترین شاعیری هەرێمی کوردستان دێتەئەژمار کە پانتایی جوانناسانە و پێکهاتەمەندی هۆنراوەکانی، سنوورەکانی بڕیوە و بە یەکێك لە ناودارترین شاعیران لە رووپەڕی شیعری هاوچەرخی جیهان ناودێر کراوە. ئەم کەڵە شاعیرە لە دەڤەری شیعر بە روانینێکی مرۆیی و ئارمانخوازانە بەردەوام لە ژێر ئەشکەنجەی ڕۆژگاری بێ بەزەیی بووە. بۆیە بۆ ماوەیەك رێگەی هەندەرانی گرتەبەر و دەرەنجام لە وڵاتی سوید گیرسایەوە و دوای سەربەخۆیی کوردستان بۆ نیشتمانی خۆی گەڕاوەتەوە. پێگەی زمانە کەشخە و هەستە جوانناسانە و نیگا مرۆڤخوازکەی شێرکۆ لەگەڵ توخمگەلێك وەك مەنفا، کۆچ و تەنیایی ...هتد، لەشیعری شێرکۆدا بوون بە واقیع خوازیی وشەگەل کە بەردەوام پێگەیەکی دیار و گەورەی بۆ ئەو چێکردووە. شیعری شێرکۆ لەگەڵ شاعیرە گەورەکانی جیهان و لە پاڵ ئەم شاعیرانە وەك لۆرکا، نازم حیکمەت، نێرۆدا بەسەربەرزییەوە یەکانگیربووە.

شایانی باسە ئاشنایی من لەگەڵ کولتوور و ئەدەبی کوردستان زۆرتر لە رێگەی خوێندنەوە و وەرگێڕانی شیعری کوردی بووە. بەتایبەت شیعرگەلێك کە لەم ساڵگەلە لەلایەن سەید عەلی ساڵحی و بابەك سەحرانەوەرد زۆر بە لێهاتوویی و شیاوی بە نیسبەت وەرگێڕانەکانی دیکە بە ئەنجام گەیشتووە و ئێمەی بە فەزا شاعیرانەکەی بێکەس رۆژ بە رۆژ نزیك و نزیکتر کردۆتەوە. بێ گومان نوێنەرە شیعری و وشە سەرەکییەکانی شێرکۆ وەکوو ئەڤین، مەنفا و خۆشویستنی نیشتمان و پاڕاستنی کولتوور و پێگەی کوردستانی ئیمڕۆ لە بەرانبەر هێزە دەرەکیی و زل هێزەکانە کە لە رێگەی وەرگێڕان بە گوێی خەڵکانی جیهان گەیشتووە. شێرکۆ شاعیرێکی مۆدێرنە و لە فەزاگەلی پەراوێزی بەدورە و بە واقیعە ئیمڕۆییەکان هەرە

سڤێن ئەریك لیدمەن

# بەردەکانی ڕۆح

## مێژووی چەمکە فەلسەفییەکان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ






وەرگێڕانی

فەرشید شەریفی

# ماتس کێمپێ

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی بابەت: باران**

**چاوپێکەوتن:** Adlibris & ALMA & SVT

**ڕانانی کتێب: ئێریک بێریکڤیست**

”دەق پێویستی بە لێوەشاوەییە، دەبێت لە شتێك بکۆڵێتەوە و خۆی لە پشت زانینەکانەوە بنووسێتەوە.“

نووسەر و چیرۆکنووسی سویدی (ماتس کێمپێ) ساڵی ١٩٦٦ لەدایکبووە. یەکەم کۆچیرۆکی بە ناوی (من هەرگیز خەونەکانم بیر نامێنێت) وەك کتێب، لە ساڵی ١٩٩٦ دا بڵاوبووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند ڕۆمانێکی شایستەی هەیە، بەردەوام گەڕاوەتەوە

سەر نووسینی چیرۆك و شێوازی نووسینی دەكرێت وەك لیریكی بناسرێتەوە، هەڵبەت ئەمە لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە كە تیایدا نەگوتراوەكان زۆرترین مانایان هەیە!

ماتس كێمپێ جگە لە نووسەرێتی، وەرگێڕانیش دەكات و ئێستاش یەكێكە لە دادوەرانی خەڵاتی ئەدەبیی ئەسترید لیندگرێن، ئەو مامۆستای پەیمانگا بووە و لە كتێبخانەی گشتیش كار دەكات. ماتس هاوسەری كریستینا ساندباری نووسەرە و پێكەوە لەگەڵ دوو كچەكەیان و پشیلەكەیان لە ستۆكهۆڵم دەژین.




(ماتس) لە چاوپێكەوتنێكدا لەگەڵ بنكەی خەڵاتی ئەسترید لیندگرێن (ALMA)

**ـ بە كورتی پێمان بڵێ ماتس كێمپێ كێیە؟**

**ماتس كێمپێ:** من خۆم وەك گەیەنەر دەناسم. لە قوتابخانەوە دەستم پێكرد، سەرەتا وەك خوێندكار و دواتر وەك مامۆستا. هەمیشە ئارەزوومكردووە شت بدۆزمەوە و بە ناو خەڵكدا بڵاوی بكەمەوە. حەزیشم لەو ڕۆڵەی خۆم كردووە، چ وەك مامۆستا و چ وەك نووسەر و لێكۆڵەر، هەروەها وەك كارمەندی كتێبخانەی گشتیش. دۆزینەوە و دانانی كتێبی تازە، كونجكۆڵییەتی و حەزی زانینە و نووسەرێتی بۆ ئەمە ڕامدەپەڕێنێت.

**ـ تۆ كە لە دونیای كتێبخانەدا كار دەكەیت و چەندین ساڵە ئەزموونت لەوەدا هەیە كە لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی هاندەری خوێندنەوەیت، پێتوایە چۆن كتێب لە وڵات و كولتووری جیاوازەوە، خوێنەرەكانیان دەوڵەمەند دەكەن؟**

**ماتس کێمپێ:** پێش هەموو شتێك، بە باوەڕی من، دۆزینەوە و گەیشتن بە ئەدەبی باش و تازە، لە فراوانکردنی تێڕوانینەکانەوە دەستەبەر دەبێت. من خۆم لەم چەند ساڵەی دواییمدا، ئەدەبی ئاسیایی و ئەفریقی، زۆرترین بەخششیان بە ئەزموونی خوێندنەوە پێشکەش کردووم. زۆر کتێبی سەرنجڕاکێش هەن، لە سوید دەستناکەون، هەندێکیان وەرگێڕدراویشن بۆ سەر زمانی سویدی بەڵام ناگەنە دەست خوێنەرە شیاوەکانیان. ئەمڕۆ بازاڕی کتێب زیاتر سەرنجی لەسەر ئەدەبی خۆماڵی و ئینگلیزییە، ئەمەش بە هۆی فرۆشییەوەیە بەڵام من وەك کارمەندی کتێبخانە، دەزانم کە داخوازی و کونجکۆڵی بۆ خوێندنەوەی ئەدەبی هەموو جیهان زۆر زۆرە.
من هەست دەکەم ئەدەبی وڵاتانی تری ئەورووپاش بە ئاسانی پەنا دەکەون، ئەو ئەدەبەی وەردەگێڕدرێت ناخرێتە سیاقی تەواوی نووسەرێتییەوە و لەگەڵ ئاڕاستە و جەرەیانی فیکری نێونەتەوەییدا دانانرێت. ئەمانە هەندێك جار وەك ناونیشانی تاك و تەرا بۆ ماوەیەکی کوورت لە کتێبفرۆشییەکاندا دەمێننەوە. لە کتێبخانە گشتییەکانیش یان دەکەونە ناو گۆڤارەکانەوە یان بەر بێژنگ دەکەون. دیارە زۆر جار کتێبی زۆر باشیان تێدایە کەچی کەمجار هیوابڕاو



دەبین. بەڵێ بەداخەوە هەستم بەمە کردووە بەڵام ئەرێییانە هەستیش دەکەم خەریکە ئەم دیاردەیە گۆڕانی بەسەردا دێت ...
شتێکی تر لە خوێندنەوەی ئەدەبی جیاوازدا، دۆزینەوەی شێوازی گێڕانەوەی ترە لە ئاڕاستە و نەریتی ئەدەبی گەلانی تردا. من چونکە خۆشم نووسەرم، ئەم پەیبردنە بۆ من زۆر بە جۆش و خرۆشە و هەمیشە بیرۆکە و ئیلهام لە ئەدەبی جیهانەوە وەردەگرم.

### ـ چ شتێک کتێب دەکات بە کتێبێکی باش؟

**ماتس کێمپێ:** دەق پێویستی بە لێوەشاوەییە، دەبێت لە شتێك بکۆڵێتەوە تا خۆی لە پشت زانینەکانەوە بنووسێتەوە. بۆ من نەوای دەنگی گێڕەرەوەکەش گرنگە، تا ئەو ئاستەی بە درێژایی خوێندنەوەی کتێبەکە، بخوازم لەگەڵ کەسی گێڕەرەوەدا بم. ئەگەر حەزم لە گێڕانەوەیەك کرد، دەگەڕێم هەموو کتێبەکانی ئەو نووسەرە دەخوێنمەوە، ئەگەرچی سەرجەم کارەکانیشی درەوشاوە نەبن. لێرەدا جۆرێك لە وتووێژ درووست دەبێت کە تیایدا شوێنکەوتنی پرۆسەی نووسینی نووسەرەکە گرنگترە لە بەدوادا چوونی تاکوتەرای کتێبەکان.
بەڵێ کتێبی باش لە لای من، ئەو دەقە

لێوەشاوەیەیە کە پڕێتی لە جوڵە و ژیان و پشکنینە لە بەدواداچوونی گۆڕەپانی ئەدەبیی نوێدا. هەروەها گێڕانەوەکەشی دەبێت وەها بێت، تا کۆتایی خوێنەر لەگەڵ خۆی ببات.

سەبارەت بە کتێبی ئەدەبی منداڵان و هەرزەکاران، پەیوەندی نێوان دەق و وێنەکان گرنگن. لەبەر ئەوەی وێنەکان جوڵە و ژیانێکی تەواو تازە دەدەن بە نووسینەکە. من خۆم ئەو کتێبی منداڵانانە زۆر نزیکە لە دڵم کە وێنەی کێشراویان زۆر تێدایە، لە وێنەکاندا زیاتر لەوە کەشف دەکەیت کە بە دەق نووسراون. بیرۆکەیەکی سەرنجڕاکێش لە خەیاڵی مندا ئەوەیە ئەگەر کتێبی گەورەکانیش وەك کتێبی منداڵان و هەرزەکاران، پێبەپێی دەقەکان وێنەیان بۆ بکێشرایە!



**ـ وەک یەکێک لە تازە دادوەرانی خەڵاتی ئەسترید لیندگرێن کە گەورەترین خەڵاتە لە جیهاندا، بۆ باشترین کاری ئەدەبی منداڵان و هەرزەکاران، چۆن لە ئەرکی خۆت دەڕوانیت؟**

**ماتس کێمپێ:** کارەکەم زۆر خۆش دەبێت. باشترین هەستی ئەوەیە لە پانتاییەکی بەرفراواندا، لە ئەدەبی جیهانیی ئاگادار دەبم. کەشفکردنی کاری تازە و گەیاندنی بەوانی دی، ئێجگار دڵخۆشکەرە. پێشبینی ئەوە دەکەم کە هاوکاردەبم لە دۆزینەوەی ئەو خەڵاتوەرگرە نوێیانەدا کە کارەکانیان زۆرترین سەرنجڕاکێشی جیهانیی بەدەست دەهێنن. هیواداریشم بتوانم کۆمەککەر بم لە ڕاکێشانی سەرنجی زیاتر بۆ هەریەك لە خەڵاتوەرگر و خەڵاتەکەش.

**ـ بۆ گەشتی ئەم هاوینەت، چ کتێبێک لەگەڵ خۆت دەبەیت؟**

**ماتس کێمپێ:** کتێبی "ژیان بەرەو دوا"ی پێر نیڵسسۆن، بەڵام هەڵبەتە چاوەڕێی لیستی کاندیدە هەڵبژێردراوەکانی ئەمساڵیش دەکەم!

**ـ هەمیشە لە کتێبەکانتدا، خوێنەر خۆی لە کەسایەتی پاڵەوانەکاندا دەبینێتەوە، وەک ئەم حەوتەمین کتێبەت بە ناوی (ئەوەی ئێستا لە بیرمە)، کە پێکهاتووە لە شانزە کوورتە چیرۆک و زۆربەی کارەکتەرە سەرەکییەکان گەنجن و ڕووداوی زۆر لە چیرۆکەکانیش لە دەوری قوتابخانەیەک دەسوڕێنەوە. پرسیاری ئێمە ئەوەیە، چی وا دەکات ئەو ژینگەیە ئەوەندە بەسەرهات بگرێتەوە؟**

**ماتس کێمپێ:** ئاشکرایە ساڵەکانی قوتابخانە، لە ژیانی ئێمەدا، زۆر کوورتە و زۆر قووڵیش مۆرکی خۆیمان تێدا دادەکوتێت. بە نیگەرانییشەوە، دەمەکانی خوێندنگا، زۆر جار بڕیاردەر دەبن لەسەر ئەوەی لە ژیانی داهاتوودا، چ ڕۆڵێکمان بەربکەوێت. قوتابخانە وێنەیەکی خۆمان پێدەبەخشێت کە زۆر ئاستەمە دووا ساڵ و پاش جێهێشتنی قوتابخانەش، بتوانین لێی ڕزگارمان ببێت. ئەمە تا ئەو ڕادەیەی کە دەکرێت، لە تەمەنی گەورەییدا، تەنها بینینەوەی هاوڕێیەکی مەکتەب، بەس بێت بۆ ئەوەی فڕێبدرێینەوە ناو ڕۆڵە کۆنەکەمان، لە کاتێکدا ئەمە نەدەبوو ئاوها بێت.

**ـ لە هەموو چیرۆکەکانی ئەم پەرتووکەتدا،**




**لە ناوەڕاستی واقیع و نووسینەوەی ئازارەکاندا، هێدی هێدی بە چوونە ناو کەرتێکی تایبەت، بە ئەفراندن، ڕووانگەی بەسەرهاتەکان وەردەگێڕی و هاوکاتیش وەرچەرخانەکە زۆر سروشتی و باوەڕپێکراو هەست پێدەکرێت. ئەم هەڵبژاردنەت چۆن کردووە؟**



**ماتس کێمپێ:** ئەگەر لە نووسینەکەمدا، کەسایەتییەکی شاعیرانەم هەبێت، دەبێت هەوڵ بدەم ئەوە بکەم کە پێشتر ڕێم بە خۆم نەداوە بیکەم، جا ئەگەر ئەو نەکردنە لەبەر ئەوە بووبێت کە پێشتر بابەتەکەم بۆ ئەدەب بە شیاو نەزانیبێت یاخود پێموابووبێت کە توانام بەسەریدا ناشکێت، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی باس لە نووسینی بەیتێك یاخود میتافۆڕێك بکەم. هەمیشە کتێبەکانم بە ریالیستی ژیان و واقیعی کۆمەڵایەتییەوە ناسراونەتەوە. لەم کۆچیرۆکەدا بە بەجێهێشتنی ریالیست خاڵێك چوومەتە پێشەوە. ئەمەش ڕەنگە سوودی ئەدەبی دەرەوەی ئەورووپا و ئەدەبی جیهانیی منداڵان بێت کە لەم ساڵانەدا بەبایەخەوە خۆمم بۆیان تەرخانکردووە.

**ـ چمکێکی گرنگ لە کتێبی (ئەوەی ئێستا لەبیرمە)دا، باس لە نووسین و بەرهەمهێنان دەکات، دەربارەی ئەوەی کێ خاوەن قەڵەمە و دەکرێت گێڕانەوە چ دەسەڵاتێکی هەبێت، هەروەها ئەوەی کە زۆر لە کەسەکان خۆیان بە بێدەسەڵات دەبینن و هەستدەکەن لە لایەن کەسانی ترەوە بەڕێوەدەبرێن. ئایا ئەمە شتێکە کە تۆ دەتەوێت سەبارەت بە ئەمڕۆی پڕ بەسەرهات بیڵێیت؟**



**ماتس کێمپێ:** لەگەڵ کاتدا، من زیاتر ناڕەحەت بووم بەرامبەر بەوەی چ دەسەڵاتێکم بەسەر کارەکتەر و چیرۆکەکانمدا هەیە. هەر بۆیە لەم دە ساڵەی دواییدا، مەبەستم بووە بە ئاگاییەوە ئەو ئەدەبە خەیاڵییە بتەقێنمەوە، ئەمەش بەوەی لێپەیدابوون و سەرهەڵدانی خودی دەق، لە دەق خۆیدا بنووسمەوە. پێموایە بەم شێوەیە نووسین زیاتر ڕاستەقینە و باوەڕپێکراو و ئارەزووکێشتر دەبێت. لێرەدا من تێکستەکانم زیاتر وەك پێشنیاری بەسەرهاتەکان دەبینم، نەك وەك بەرهەمهێنانی خەیاڵێکی ڕاستەقینە. هەڵبەتە ئەمە خستنەڕووی کێشەیەکە کە دەمخواست ئەمڕۆ لە کۆمەڵگاکەماندا، زیاتر گفتوگۆی لەسەر بکرایە ...

لە کوورتە وتووێژێکی تەلەفزیۆنییدا

سەبارەت بەوەی (ئەلیس مۆنرۆ)ی چیرۆکنووس خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی بۆ ساڵی ٢٠١٣ وەرگرتووە، (کێمپێ) دەڵێت:

هەڵبژاردنی چیرۆکنووسێك بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ، دەکرێت وەك بەرزنرخاندنی چیرۆك، پلەیەکی باڵا بداتە ئەم ژانرە و هیوادارم لە بواری ئەدەبدا، پانتایی چیرۆك فراوانتر بێت.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە چۆنە دوای نووسینی ڕۆمان، دەگەڕێتەوە سەر نووسینی چیرۆك، ماتس کێمپێ دەڵێت:

وەك چۆن ئەلیس مۆنرۆ و زۆر نووسەری بەتوانای تر، بارودۆخی ژیانیان وا نەڕەخساوە کە جێگای زۆرترین نووسینی تێدا ببێتەوە، منیش لە ژیانمدا جگە لە نووسین، ئەرکی بەخێوکردن و خێزان و پەروەردەی منداڵم لەسەرە. هەڵبەت پێم گرنگە بنووسم بەڵام بەبێ ئەوەی ژیانی نووسینم و ئەو ژیانەی ترم بەیەکدا بدەن. بۆیە زیاتر نووسین لە فۆڕماتە کوورتەکەیدا هەڵدەبژێرم و شێوازی کوورتنووسیش لە لام





پەسەند و سەرنجڕاکێشترە.

ماتس لەبارەی ئەزموونی ئەلیس مۆنرۆ و نووسینەوە بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

ئەلیس مۆنرۆ نووسەری فۆڕماتی کوورتی نووسینە و گەورەترین خەڵاتی ئەدەبی وەرگرتووە. ئەمە ئیلهامبەخش دەبێت بۆ زۆر کەس کە بێ سڵکردنەوە بخوازن لە جیاتی نووسینی درێژی وەك ڕۆمان، برەوی زیاتر بە نووسینی کوورتی وەك چیرۆك بدەن. بە بۆچوونی تایبەتی خۆمیش ئەوەی حەزی پێدەکرێت و سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێت، چۆنییەتی خودی نووسینە ئیدی زۆر فەرق ناکات ئایا دەقەکە چیرۆکە، شیعرە یاخود ڕۆمان.

# خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی "چرای شەو داگیرسا و دەرگاکە ئاوەڵایە"

لە گێڕانەوەکانی ماتس کێمپێ دا، ڕۆژە ئاساییەکان، ئەو ڕۆژانەی دەوام هەیە و پشوو نین، کات و دەمی شیرین نین. لێرەدا مەبەست ئەوە نییە نووسینەکانی کێمپێ پڕ بن لە کارەسات و سامناکی، بەڵکوو دەقەکانی باسن لەو ساتگەلە لەناکاو و هەستبزوێنانەی تژین لە هەرەس و دڵەکووتەی پێوابوون و حساباتی هەڵە، هەروەها باسن لە ئاماژە ناڕوونەکانی ڕۆژگار و زەردەخەنە باو و پەنهانەکانی.

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٦ەوە، منداڵی و هەرزەکاریی و ژیانی خێزان، لە سەرەکیی ترین بابەتەکانی نووسینی کێمپێ ـن. بە هەمان شێوەش لە کۆ چیرۆکی "چرای شەو داگیرسا و دەرگاکە ئاوەڵایە"دا گرنگی زۆر بە هەمان ئەو تێمایانە دەدات. لەم کتێبەدا گەڕانەوە بۆ سەر ژینگەی ژیانی مرۆڤەکان بەرچاوە و دەکرێت سەرجەم دوانزە چیرۆکەکە، وەك دوانزە بەشی ڕۆمانێك بخوێندرێتەوە.




چیرۆکەکانی ئەم کتێبە زیاتر باس لە دایکان و باوکان و نیگەرانییەکانیان دەکات. نیگەرانیی دایکان و باوکان بەرامبەر منداڵەکانیان و هاوسەری منداڵەکانیان و هەروەها لە چۆنییەتی تێگەشتنی ڕۆڵی خۆشیان لە مەیدانەکەدا.
نیگەرانییەك کە هەندێك جار دەگاتە ترس لە جۆرە بێزارییەکی ناسراو بە ترسان لە ڕاستگۆیەتی و لەوەی جارێك بۆ هەمیشە ڕووبەڕووی ئەو لێڵییە ببنەوە کە لە شەودا خەو دەزڕێنێت. هەروەها نیگەرانیی بەهۆی ترسانەوە لەو ترسەی کە شتێك بەسەر منداڵەکاندا بێت.

کێمپێ ڕیالیستێکی کارامەیە و تێڕووانینی تایبەتی بۆ ئەو ڕەنگجودابیانە هەیە کە لە واتادا جیاوازی گەورەیان هەیە. ئەو لە وەسفکردنی نیوە نائاگایی مرۆڤەکاندا، توانایەکی زۆر باشی هەیە. هەروەها لە وەسفی ئەو وردە مامەڵە ناچارییانەشدا کە ئارەزوو دەکرێن بەڵام کێمپێش وەك زۆر نووسەری تر هەندێك

هۆنینەوە و وشەی ناپێویست بەکاردەهێنێت.
دەبێت لە بیریشمان بێت ماتس نووسەرێکە باوەڕی بە نووسینی خۆی زۆرە، چ لە بواری زماندا و چ لە شێوازی گێڕانەوە و بە بەسەرهات کردنیشدا.

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی، دوو سێ چیرۆکی تێدایە شتێکیان کەمە، کە دەشێت کەموکوڕییەکە لە گرێ و هۆکارەکاندا بێت یاخود لە خەیاڵەکەیدا. بەڵێ، لەو چەند چیرۆکەدا خوێنەر هەندێك جار حەز دەکات کێمێ ئەندێشەی ئازادتر و وێنەکانی زۆرتر بوونایە ...

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم کتێبە زۆر چیرۆك و مەبەستی گەیەنراوی سەرکەوتووی تێدایە، بۆ نموونە کوورتە چیرۆکی (سیستەمی SAB) کە دەربارەی شڵەژاوی مەنەلۆگی باوکێکە لەگەڵ کچەکەی، سەبارەت بە پێداویستییەکانی ژیان، لە ڕێی باسکردنی سیستەمی کۆمپانیای ئۆتۆمبێلسازی سابەوە. یاخود کوورتە چیرۆکی (مەشقی نووسین) کە تیایدا کێمێ تۆنێکی بێوێنە و ئێجگار جوان دەدۆزێتەوە کاتێك چەندین شێوازی جیاواز تاقیدەکاتەوە بۆ لێدوان و باسکردنی کیژێکی سادە و ساکار. هەروەها لە کوورتە چیرۆکی (لاپەڕە دڕاوەکان)دا لێزانانە باس لە مانەوە لە خانوویەکی هاوینە و تەواوبوونی پەیوەندییەك دەکات، وەکتریش چیرۆکی (کەس حاڵی لە منداڵەکەی باشتر نابێت) کە بەسەرهاتی کچێکە، پوختترین و هاوسەنگ ترین دەقە لەم کتێبەدا.

ئیسماعیل کاداری

# جەنەڕاڵی سوپای مردوو




لەفارسییەوە

محەمەد کەریم



# گفتوگۆیەك لەگەڵ ماریۆ ڤارگاس یۆسا

و. لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

**ئەو پاڵنەرانە چی بوون کە وایلێکردیت ڕۆمانی " ئاهەنگی سابرێن"** The Feast of the Goat **بنوسیت؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ساڵی 1975 بۆ ماوەی هەشت مانگ سەردانی کۆماری دۆمینیکام کرد بە مەبەستی وێنەگرتنی فلمێك کە بیرۆکەی ڕۆمانێکم بوو بەناووی ماپتن پانتۆجا. لەو ماوەیەدا سەبارەت بە دیکتاتۆرێکی وەك ترۆجیلۆ بیستبووم و خوێندبوومەوە. بیرۆکەی نووسینی ئەو ڕۆمانەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە. ئەوە پرۆژەیەکی دوورو درێژە. چەندین جاری تر ڕۆیشتمە کۆماری دۆمینیکان بۆ خوێندنەوەی بڵاوکراوەکانیان و گفتوگۆ لەگەڵ زۆرێك



خەڵکی ئەویش: قوربانیەکانی دەستی دیکتاتۆر و خەڵکی بێلایەن و تەنانەت بینینی زۆرێك لەوانەی کە لەگەڵ ترۆجینۆ کاریان دەکرد.

**ئەی تا چ ڕادەیەک ڕۆمانەکەت لەبارەی ئەلبێرتۆ فوجیمۆریەوە بوو؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ئەها. ڕۆمانەکەم زیاتر سەبارەت بە ژیانی ترۆجیلۆ نووسیوە، بەڵام لەڕاستیدا گەر کەسێك بیەوێت سەبارەت بە دیکتاتۆرێك بنووسێت ئەوە مەبەست هەموو دیکتاتۆرەکانە، باسکردنە لە تۆتالیتاریزم لە هەر شوێنێك بێت. من لەم ڕۆمانەدا مەبەستم تەنها ترۆجیلۆ نییە، بەڵکو دەمەوێت باس لە دیکتاتۆرێکی ڕەمزی بکەم یان شتێك کە لە شێوەی دیکتاتۆردا لە هەر کۆمەڵگەیەکی تری جیهاندا ئەگەری دەرکەوتنی هەیە.

**بەتایبەت لە ئەمریکای لاتین.**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** کاتێك لە پەنجاکاندا لە زانکۆ بووم، ئەمریکای لاتین پڕ بوو لە دیکتاتۆر. ترۆجیلۆ کارەکتەرێکی سیمبوڵی بوو لەبەرئەوەی، بێگومان، دڵڕەقی ئەو، گەندەڵی، بەتاڵانبردنی سامانی میللەت، سەرجەم کردەوەکانی نموونەیەکی باش بوو بۆ سەرجەم دیکتاتۆرەکان.

**مەبەستت گەندەڵی دەسەڵاتە....**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** دیکتاتۆرەکان هەڵگری کارەساتی سروشتی نین. شتێك کە دەمەوێت باسی بکەم: چۆن دیکتاتۆرەکان دەتوانن خەڵکی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن، تەنانەت دەتوانن خەڵکانێك بۆ بێدەنگ بوون لەبارەی قوربانیەکانیشیانەوە بخوڵقێنن.

**ئایا لە ئەزموونی سیاسی خۆتاندا هیچ پێشبینیەکتان بۆ دیکتاتۆریەت کردووە؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** سێ ساڵ کارکردنم لە بواری سیاسەتدا زۆر کۆمەکی کردم بەوەی کە خواست بۆ دەسەڵات چ ڕێگەیەك دەگرێتە بەر بۆ وێرانکردنی عەقڵی مرۆڤ، وێرانکردنی پرنسیپ و بەهاکان و کردنی مرۆڤ بە دڕندەیەکی بچوك.

**ئەم ڕۆمانەت " ئاهەنگی سابرێن" لە دیدی ئافرەتێکەوە نووسراوە.**
**ئایا کێشەیەک لەمەدا هەیە؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:**سەرکێشییەك هەیە نەك کێشە. من ویستومە ژنێك ببێت بە کارەکتەری سەرەکی لە ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەمدا، چونکە من پێم وایە لە سایەی دەسەڵاتی ترۆجیلۆی دیکتاتۆردا ژنان گەورەترین قوربانین. لە ئۆتۆریتەی دیکتاتۆردا دەبینین ڕەفتاری پیاوسالاری ترۆجیلۆ سێکس بەکار دەهێنێت، سێکس نەك وەك چێژ بەڵکو وەك هۆکارێك بۆ دەسەڵات. لەمەشدا دیکتاتۆر زیاد لەپێویست لەهەموو دیکتاتۆرەکانی دنیا دیکتاتۆرترە. بۆنمونە ترۆجیلۆ لەگەڵ هاوسەری هاوڕێ و شوێنکەوتووەکانیدا دەچووە سەر جێگەی نووستن و لەگەڵیان دەنووست.

**وەک درامایەکی شکسپیر.**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** هەر چۆنێك بێت. درامای Coriolanus تەواو درامایەکی فەنتازییە.

**کەی ئێوە بۆ یەکەمینجار زانیتان کە دەبن بە نووسەر؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** لەوە دەستپێناکات کە کەی بووم بە نووسەر، بەڵکو لەوەوە دەست پێدەکات کە لە کەیەوە دەخوێنمەوە. وابزانم لەتەمەنی پێنچ ساڵییەوە فێر بووم بخوێنمەوە، وابزانم ئەوە گرنگترین شت بوو لە ژیانی مندا کە ڕوویدابێت.

**دەکرێ بپرسم زیاتر چیتان دەخوێندەوە؟**
**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** من زیاتر ڕۆمانی پەرجوئاسام دەخوێندەوە read novels of adventure. لەو کاتانەدا منداڵان زیاتر تێکستەکان دەخوێننەوە نەك شتە گاڵتە ئامێزەکان. من گۆڤارەکانم لەبیرە کە دەمخوێندنەوە. من دەستم کرد بە نووسینی ئەو جۆرە چیرۆکانە. چونکە من خەمم دەخوارد کە کەسی تر نییە لەم چیرۆکانە بنووسێت. هەندێ جار من دەهاتم کۆتاییەکانم دەگۆڕی. بەکورتی سەردەمی نووسینی من لەم جۆرە گەمەیەوە دەستی پێکرد.





**لەوانە وەک ڕۆمانەکانی " پلانەکەی پوریێ" و "ژولیا و  نوسەری شانۆکە".**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ئەوە ڕاستە. کاتێك من چومە زانکۆ زانیم وەکو نووسەر دەبێ چی بکەم. بەڵام لە هەمانکاتدا لەوەها کۆمەڵگەیەکی وەك ئەوەی مندا زۆر گران بوو بڕیار بدەی تەنها نووسەر بیت... وە من بڕیارمدا ئەوە بکەم. بۆیە سەرباری ئەوەی ژیانم بۆ ئەدەب تەرخان کرد چانسی ئەوەشم هەبوو شتی تریش بکەم لە ژیانمدا، بەڵام ئەدەب گرنگترین کاری من بوو، بەڵام کاری تریشم کردووە لەوانە...

**کاری ڕۆژنامەگەری؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** بەڵێ. بەڵام کە ساڵی 1958هاتمە ئەوروپا بڕیارمدا تەنها ببم بە نووسەر و هەموو وزەی خۆم بۆ نووسین تەرخان بکەم. بۆیە وەزیفەکانی تری ژیانم پەراوێز خست. ئەوە چرکەساتێکی زۆر گرنگ بوو لە ژیانی مندا.

**زۆرێک لە کتێبەکانت کێشەیان بۆ دروستکردووی. وایە؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** وەزیفەی نووسین بریتیە لە نووسین بە سەختیەوە، نووسەر دەبێت بە دڵسۆزییەوە قسە لەسەر ڕووداوەکان بکات و بەرگری لەوە بکات کە خەڵك بڕوایان بە چی هەیە ئەمەش بەوپەڕی توانایەوە. من بڕوام وایە نووسەر بەرپرسیارێتییەکی ئەخلاقی لە ئەستۆدایە، کە نوسەر تەنها وەك هونەرمەندێك وێنەی شتەکان ناکێشێت. من بڕوام وایە نوسەر هەڵگری جۆرێك لە بەرپرسیارێتیە لانی کەم لە بەشداریکردنی لە مشتومڕی مەدەنیدا. بڕوام وایە ئەدەب دەستکورتترە لەوەی ببێتە ئەجێندای سەرەکی خەڵك و کۆمەڵگە و ژیان.

**ئایا فراوانکردنی ڕۆڵی گشتی نووسەر  بۆتە ئاوێنەیەک کە کاریگەری هەبێت لە ئەمریکای لاتیندا؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** لەو بڕوایەدام ڕۆڵی نووسەران لە مشتومڕی گشتیدا شتێکە کە جیاوازی دەخوڵقێنێت. گەر کەلتور بەتەواوی لەوە دابڕا کە ڕوو دەدات بێشك دەبێتە بوونێکی تەواو ساختە.

**ئایا ئەمە حەزێکە بۆ گفتوگۆ لە سرووشتی تۆدا یان خۆی بۆتە چەقی ئەو مەسەلانەی دەتەوێت لە ڕۆمانەکانتدا تەعبیری لێ بکەیت؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** من بەئاسانی کتێبەکانم لە یەك بۆتەدا لە قاڵب نادەم. بەبڕوای من ئەوە یەك دەربڕینە. من هەمیشە هەوڵی ئەوەمداوە کە نووسەرێکی سەربەخۆ بم. ئەوەش بەو مانایە نییە من هەڵە ناکەم. ڕەنگە من هەڵەی زۆرم کردبێت لە ژیانمدا.

**چی وایلێکردی کە ڕوو بکەیتە سیاسەت؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ئەها. من هەمیشە ئالودەی سیاسیەت بووم، بەڵام وەك ڕوشنبیرێك. لە کۆتایی هەشتاکاندا پێموابوو کە پێویستە بەشداری دڵسۆزانە سیاسەت بکەم... ئەوە بڕیارێکی هەڵە بوو.

**ئایا تۆ سەبارەت بە هەڵەی بۆچوونەکانت توشی شۆک هاتیت؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** بەڵێ. ئەوە خراپتر بوو لە شۆك. لە هەڵبژاردنی دیموکراسیدا تۆ یان براوەی یان دۆڕاو، بەڵام لەدوایدا ئەوەی کە ڕوودەدات تەواو سەرگەردانت دەکات. فۆجیمۆری هەڵبژاردنەکەی بردەوە. وە دواتر ئەو چی کرد، هەندێك ڕیفۆرمی لەوەدا کرد کە من پێشنیارم کردبوو. وە پاش چەندساڵێك فۆجیمۆری تەواو بوو بە کەسێکی جەماوەری، وەك ئەوەی دیکتاتۆرێکی وەکو ترۆجیلۆ و هەر دیکتاتۆرێکی تر دەیانکرد ئەویش بوو بە دیکتاتۆر. ئەوە بەڕاستی شۆکئامێز بوو.

**ئایا تۆ لەو بڕوایەدانیت کە خۆت لە پشت بەرهەمەکانەوە شاردبێتەوە، یان باسی ژیانی خۆت لە بەرهەمەکانتدا کردبێت؟ لەوانە لە ڕۆمانی ماسیەک لە ئاوەکەدا** A Fish In The Water ؟

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ئۆە. بەدڵنیاییەوە. ئەدەب ئەم دەسەڵاتە بێئەندازەیەی هەیە. تۆ لەبارەی شتێکەوە دەنووسیت کە ڕەنگە تەنانەت ئەزمونێکی خراپی خۆت بێت. من لەو بڕوایەدام تۆ دەتوانیت خەمەکانی خۆت لە بەرهەمەکاندا باس بکەیت وە بەتەواوی ئارامیت پێ ببەخشێت.





**چەندێک ژیانی خۆت لە لەندەن دەگوزەرێنیت؟**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** دامناوە لانی کەم سێ مانگ لە سالێکدا ژیان لە لەندەن ئەزموون بکەم.

**تۆ لەم وڵاتەدا بەوە ناسراوی کە پشتیوانیت لە خاتوو تاتچەر کردووە.**

**ماریۆ ڤارگاس یۆسا:** ئەوەی بەسەر خاتوو تاتچەردا هات خەمبارانە بوو. کاتێك ئەو هاتەسەر کورسی دەسەڵات بێئەندازە کاریگەری خۆی لەسەر ژیانی بەریتانیەکان و تەنانەت کۆمەڵگە و سیاسەتیش جێهێشت. بەڵام ئەترسم ئێستا وەك کۆنزێرڤاتیڤێکی توند کە شەڕی دژ بە ئەوروپا کردبێت بێتەوە بیری خەڵك. بەڵام ئەوە گرنگە کە چی بەسەر بەریتانیادا هاتووە، لەبەر ئەوەی من دڵنیا بووم کە باشترین شوێنکەوتەی خاتوو تاتچەر، تۆنی بلێرە، کە کاری لەسەر جۆرێك لەو پرۆژە ڕیفۆرمیانە کردبێت کە خاتوو تارچەر پێشتر کاری لەسەر کردبوو.

سەرچاوە:

**Sunday 7 April 2002 the Observer**

# هونەری نووسینی کورتەچیرۆک

**میران ئابراهام**

کورتەچیرۆك لە هەموو [illegible] دەرەوەی سنووری ستایلی ئەدەبی و کتێبەکاندا، ڕۆژانە ئێمە خەریکی گێڕانەوەو تاوتوێ کردنیانین، کاتێك دوو کەس پێك دەگەن یان میوانداری یەك دەکەن، لەگەڵ هاوڕێو دوستانماندا... زۆرینەی لێدوانەکانمان بێگومان پشت دەبەستین بە هێزی گێرانەوە، کورتەباس، ڕوداوەکان، چیمان بیستووەو بینیوەو بۆنکردووە، تامکردووەو دەست لێداوە،هەڵبەتە هەر کەسەو بەگوێرەی تواناو هێزی خەیاڵی خۆی بەرگێکی جیاواز دەکاتە بەر گێروانەوەی ڕوداوەکان، هەر ئەو گێرانەوەو کورتەباسانەن کە دەبنە کەرەستەی کورتەچیرۆك یان نۆڤێلە یان ڕۆمان. زۆرێك لە بەسەر هات و ڕوداوەکان لەناو ولاتی ئێمەدا سالانێك بگرە زۆر زیاتر دەماودەم دەکەنو گۆڕانکاریان بەسەردادێت یان



لەبیر دەچنەوە،هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تاکی کورد خاوەنی ڕۆژ ژمێر یان دەفتەری یادگاری تاکەکەسی خۆی نییەو بەدەگمەن ڕوداو یان بەسەرهاتی ڕۆژانەی خۆی تۆمار دەکات، ئێستاش وەك سەدەکانی ناوەڕاست زۆرینەی تاکی کورد پشت بە گێڕانەوەی دەماودەم دەبەستێت، بێگومان بەبیری مرۆی کورد نوسینەوە تەنها ئەرکی نووسەرانە، بەپێچەوانەوە بەهۆی ئەوەی کە تاکی کورد نووسین نەبووەتە کلتووری... نوسەری کوردیشی دەست کورتو هەژار کردووە... لە گەلێك وڵاتدا  نووسینەوەی ئەویادگاریانە بوونەتە کەرەستە بۆ نووسەران، چونکە ئەوە تەها نووسەرە کە یاری بە کات و شوێنو کاراکتەر دەکات و بەسەرهاتەکان کورت یان درێژ دەکاتو فۆرم و تام و لەزەتێکی تریان پێدەبەخشێت یان ڕەنگی تریان بەبەردا دەکاتو بە نوسینو کتێبیان دەکات.بێگومان بۆ نوسەرێك کە بە هەرپێنج هەستەکەی ڕۆژانە ئامادەیی هەبێت لەناو شوێنە گشتییەکاندا، دەتوانێت پارچەو کەرەستەی پێویستی دەستکەوێت بۆ هۆنینەوەی چیرۆك... بەتێکەڵاو کردنی توانای خەیاڵی خۆی، من لەم بابەتەمدا باس لە زمان ناکەم، بێگومان کاتێك ناوی نوسەر دەهێنم... دەبێت خاوەنی ئەو کەرەستە بنەڕەتیو گرنگە بێت کە زمانە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست یان پێشتر... بەسەرهاتەکان بە دەگمەن دەنووسرانەوە، نەوە لە دوای نەوە دەماودەمیان دەکرد، یان لەڕێگای شانۆوە لە کوچەو کۆڵانو بازاڕەکاندا ڕاستەوخۆ گێڕەرەوە لەگەڵ بینەردا بەرەو ڕووی یەك دەبوونەوەو لە گێرانەوەیەکی شانۆ ئامێزدا ڕوداوەکان نمایش دەکران.

ئێمەی مرۆڤ لەسەر دەربڕینو گوێگرتن دەژینو بوونی کەسایەتی خۆمانی پێ دەسەلمێنین، ڕۆژانە هەموو یەکێك لە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ چواردەورماندا پێك هاتووە لە گێرانەوەو لێدوانی چیرۆك ئامێز، کورتەباسو گێرانەوەی بەسەرهاتو ڕووداوی کورت و درێژ، بۆ نووسەر ئەوانە هەموو کهرەستە و سەرچاوەن بۆ نوسینی چیرۆك، بە دەگمەن وا پێویست دەکات کە نووسەر ئەودیو سنوور بۆ کەرەستەی چیرۆك بگەڕێت، بەتایبەتی لە ئێستادا... لە میدیاکانو لە شوێنە گشتییەکاندا بەردەوام باسو خواستو گێرانەوەی ڕوداوو بەسەرهاتی کورتو درێژ دەبیسترێن... هەڵبەتە هیچیان دەقاودەق چیرۆك نینو تەنها نووسین و گواستنەوەیان بوێت، ئەگەر نووسەر پشت بە هەستەکانیو خەیاڵی ببەستێت بێگومان ئەو کەرەستانە دەکات بە

بەرهەمی خەیاڵی خۆیو پۆلێنیان دەکاتو بەرگێکی هونەرییان دەکات بەبەردا.

هەروەك چۆن نووسەرە ناودارەکانی جیهان لەبواری چیرۆك نوسیندا دایم پشتیان پێبەستووەو کەرەستەی چیرۆکەکانیان لە نزیکو چواردەوری خۆیان بەهێزی هەستەکانیان کۆکردۆتەوە، بۆ نموونە (ئەلیس مۆنرۆ، ڕایمۆند کارفەر، تۆماس ڤۆلف) ڕوداوو بەسەرهاتی نێو چیرۆکەکانیان لە دەرەوەی گوندو شارو وڵاتی خۆیان تێ ناپەڕن، یان چیخۆف و سکۆت کە بە هەمان شێوە چیرۆکی بێوێنەیان نووسیوە لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژو کاتو ئەو سەردەمەی ئەوان تێیدا ژیاون، ئەم نووسەرانە بە مانای تەواو وەك نووسەر لەناو کۆمەڵگای خۆیاندا ژیاونو بە هێزی هەستەکانیان بەردەوام لە چواردەوری خۆیان کەرەستەی نووسیەکانیان کۆکردۆتەوە.

کەی نووسینێکی ئەدەبی دەبێتە کورتەچیرۆك؟ ئایا کورتەچیرۆك ژانرێکی تایبەتە؟ یان جیاوازی لەنێوان چیرۆكو کورتەچیرۆکدا چییە؟

هونەری نووسینی کورتەچیرۆك هونەرێکە کە دەتوانین بە بنەمای یان دەستپێکی بیرۆکەی نوسین بەگشتی دایبنێین، هەموو کورتە چرۆکێك نووسەر دەتوانێت لە بواری کاتو شو ێن و کا ر ا کتە ر ە و ە پەرەی پێبداتو تائاستی نۆڤێلە یان ڕۆمان درێژی بکاتەوە، هەنوکە نۆڤێلەو ڕۆمان لە چەندین کورتە چیرۆکی لێك هەڵکێشراو چنراون، لێرەدا کە ئێمە لە نێوان وشەی چیرۆك و کورتەچیرۆکدا ئەمبەراوبەر دەکەین، بێگومان لەنێوان ئەم دوانەدا جیاوازییەك نییە و بە دوو ژانری لەیەك جیاواز ناوزەد ناکرێن، نووسەرانو زانایانی بواری ئەدەب بەکورتە چیرۆك دەڵێن برازای نوڤێلەو ڕۆمان بەڵام لە سەدەکانی ڕابووردوودا هەردەم بە دەستە خوشك ناوبراوە.

نیکۆلای گۆگۆڵ دەربارەی کورتەچیرۆك دەڵێت: بۆ من کە لە لاپەڕەیەك دواندا جیهانێك دەخوڵقێنم، کەرەستەی ئەو جیهانە... بەرهەمی ڕەنجو ماندووبوونی هەستەکانمن، کەلێرەو لەوێ گوڵبژێریان کردووەو بۆیان کۆکردوومەتەوەو بوون بە بەشێك لە خەیاڵم، خۆم لە دوورییەوە دەوەستمو ڕەنگ و دەنگو بۆنی ڕۆحی خۆم تێکەڵ بە هەوای ئەو جیهانە ناکەم.

کاتێك من لە (قوتابخانەی نووسەرو هونەری نووسین)بووم، یەکێك لە مامۆستاکان (ئەیسۆ پۆست) نووسەرو ڕۆژنامەنووس لە وڵاتی هۆڵەندا، لە سەرەتای ساڵی یەکەمماندا ئەم چەند خاڵەی بەسەر قوتابییەکاندا دابەشکرد کە تایبەت بوو بە نوسینی کورتەچیرۆك:

- لانیکەم یەك کاراکتەر ناوبهێنە یان بخوڵقێنە





بەجۆرێك كە خوێنەر هۆگری بێت. گرنگە كە ئەو كاراكتەرە بە دەنگو ڕەنگی خۆی بەشداربێت لە دیالۆگو ڕووداوەكاندا، نەك تەنها بەناو لەوانی تر جیاكرێتەوە.

- هەموو كاراكتەرێك پێویستە لە پێناوی شتێكدا بژی... ئەگەر بۆنموونە لەپێناو پەرداخێك ئاویشدا بێت.

- هەموو ڕستەیەك گرنگە وەك پێویست بەكار بهێنرێت، یەك بەیەكی ڕستەكان دەبێت بەردەوامی بدەن بە ناساندن یان نوسینەوەی ژیانی كاراكتەر یان ڕووداو.

- دەستپێكت با بۆنوبەرامی لە ناوەڕۆكو كۆتایی چیرۆكەوە نێزیك بێت.

- سۆزت بۆ كاراكتەری ناو چیرۆكەكانت نەبێت... بێلایەنبە وەك (سەدیست)ێك ڕەفتاریان لەگەڵدا بكە، هەرچەندێك كاراكتەرەكانت شۆخ، لێهاتوو، بێدەنگ، هەژاربن، هەوڵبدە بەشداری ڕووداویان پێبكەو با ئازار بچێژنو ئازار بدرێن، تاكو خوێنەر لەو ڕێگایەوە كەسایەتییەكان بناسێتەوە.

- خۆت دوورەپەرێز بگرەو كەسایەتی خۆت بپارێزە، ئاگاداربە كۆپی كاراكتەری خۆت وەكو نووسەر دووبارە مەخوڵقێنەرەوە، هەروەك چۆن لەم جیهانەی ئێستاو ڕابردوودا بەدەگمەن دوو مرۆڤ لەیەك دەچن تەنها وەك ناو نەبێت.

- كات گرنگە، یاریكردن لەگەڵ كاتدا، دابەش كردنی كات بەسەر ئەو دیمەنانەی گرنگیان هەیەو دەبنە هێڵی سوورو سەرەكی چیرۆك.

- هەوڵ بدە هەرلە سەرەتاوە زانیاری پێویست بە خوێنەر بدەیت، تاكو تەواوی خەیاڵی پابەند كەیت بە چیرۆكەكەتەوە، زانیارییەك كە پەیوەست بێت بە ڕوداوی ناو جیهانی چیرۆكەكەت، خۆت بپارێزە لە زیادەڕۆییو بەیتوبالۆرە و فەلسەفەی وشكو پەندی پێشینان و چەلەحانێ و وتاری ڕۆژ، یانی لە كلتوری سنووری ئەو جیهانە دەرمەچۆ كە خۆت خوڵقاندووتە.

- كاتێك وەسف دەست پێدەكات كات دەوەستێت، كە كاتت وەستاند ئاگاداری ڕووداو بە نەبێت بە ژێر درێژدادڕی وەسفەوە.

هەر لە دەرسەكانی هەمان مامۆستادا (ئەیسۆپۆست)وە ئەم چەند خاڵە:

- دوای هێڵی سوور كەوە:

پێش ئەوەی تەنها وشەیەك چییە لە چیرۆكەكەت بینووسیت، پێویستە لە خەیاڵتا خۆت یەكلایی

کردبێتەوە، مەبەستت لە نووسنی ئەو چیرۆکە چییەو بیرۆکەی هێڵی سوور لە کوێوە دەکێشیتو لە کوێدا کۆتایی دێت، ئەو ڕاستە هێڵەی کێشاوتە گرنگە... چونکە یەکلایی کەرەوەیەو دەبیت سنووردار بێت چونکە ئێمە باس لە کورتەچیرۆك دەکەین.

- دەستپێك:

لە چیرۆکی کلاسیکدا زۆرینەی چیرۆکەکان بە کاراکتەر دەستیان پێدەکرد، ئێستا زۆرینەی نووسەرانی کورتەچیرۆك بە ڕووداو یان پرسیارێکی ناڕاستەوخۆ کە لە خوێنەری دەکەن دەست پێدەکەن، بێگومان نووسەر لێرەدا ئازادە.

- لە ژیانی ئەودا:

زۆرینەی کورتەچیرۆك، یەك دیمەنە لە ژیانی کەسایەتییەك، بۆ زۆر لەوە زیاتر و دەیان و سەدان دیمەنی کورت و درێژ بوارنییە، کاتێك هەڵبژێرە... یەك کاتژمێر، دوانیوەڕۆیەك، یان هەرچ ساتێك، بەڵام ئاگادار بە لە سنوور دەرنەچیت، ئاگاداری کات بە زۆر پرسیار بە کراوەیی بەجێ مەهێڵە بۆ خوێنەرو لەکاتی دیاریکراودا دیمەنەکان بە وشە نمایش بکە.

- کەم یان زۆر:

خوێندنەوەی کورتەچیرۆك کاتی کەم دەوێت بۆ خوێنەر، قسەی زەردوسوور بۆ ئەم ژانرە ناگونجێت، کێشانی چەندین هێڵی سەرەکەیو لاوەکی لە کورتەچیرۆکدا زۆر جار ماڵوێرانییە، هێڵی سوور گرنگە هەرچ وشەو ڕستەیەك لە خزمەتی یان لەژێر سێبەری هێڵی سوری چیرۆکەکەدا نەبوو بێ دوودڵی ڕەشی کەرەوە، هەروەها کاراکتەری زیادە و لاوەکیش گەر هیچ لە پلۆت ناگۆڕن شاربەدەریان کە، هەموو کارکتەرێك کە لە دیمەنێکدا دەردەکەون پێویستە بەردێك بخاتە سەر ئەو کەڵەکەی کە تۆ خەریکی دروستکردنیت بە وشە بۆ خوڵقاندنی جیهانێك، کورتەچیرۆك یانی بەکەمترین وشە مەبەستت بەدەستەوە بدەیتو ڕوداوێك وێنەبکەیت.

لە خەیاڵی هەموو نووسەرێکدا کە لە سەرەتادا بێتو تازە سەرقاڵی نوسینی کورتەچیرۆك بێت، پرسیارگەلیك لەلای قوت دەبنەوەو بەردەوام لە گەڕاندایە لە وەڵامیان، بۆ نموونە:

چۆن چیرۆکەکەم دەست پێبکەم؟ چۆن چیرۆکەکەم کۆتایی پێبێنم؟ چۆن کاراکتەرەکانم بناسێنمو چۆن خۆم وەکو نووسەر یەك بەیەکی کاراکتەرەکانم بناسم؟ بە پلۆت یان بە کاراکتەر دەست پێبکەم؟ لە کورتەچیرۆکدا دەتوانم گێڕەرەوە بگۆڕمو یاری بە کات بکەم؟ بە دڵنیاییەوە زۆر لەوەزیاتر. دەتوانم بڵێم گرانە وەڵامی دەقاودەقی یەکێك






لەم پرسیارانە بدەینەوە، چونکە هەر چیرۆکە و تایبەتمەندی خۆی هەیە.
بۆ نموونە: بە ڕووداو دەست بە نووسینی چیرۆکەکەم بکەم یان بە کاراکتەرو ناساندنی کاراکتەر؟
دەیان کتێبو بابەت لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارە نوسراونو ڕاکان تاڕادەیەك نزیکن لەیەکتری، بەڵام سەرەنجام وەڵامێکی دیاریکراو نییە کە نووسەر هەڵی بژێرێتو دەقاودەق جێبەجێی بکات، تایبەت مەندیو ئاڵۆزی هونەری نووسین بەگشتیو هونەری چیرۆك نووسین بەتایبەتی لێرەدا دەردەکەوێت، کە یاسایەکی دیاریکراوو جێگیر بوونی نییە، ئایا چۆن کورتەچیرۆك یان نۆڤێلە یان ڕۆمان بنووسین، ئەو کتێبانەی لەسەر چۆنییەتی نووسینی چیرۆك نوسراوون بۆ نووسەر دەبنە سەرچاوە، کە توانای هۆنینەوەو گێڕانەوەی نووسەر دەوڵەمەند دەکەن، ئەگەر نووسەر بییەوێت ستایڵی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەگەر نا ئەوا ئەو بەرهەمە دەچێتە قاڵبی دووبارەبوونەوەی ئەوی پێش خۆی. هونەر بەگشتیو هونەری چیرۆك نووسین بەتایبەتی هاوشێوەی ماتماتیك نییە... یەك زاید یەك دەکاتەدوو، نوسینی کورتەچیرۆك هاوکێشەیەکی کراوەیەو کە نووسەر بە هێزی خەیاڵ و هەستەکانی و ئەزمونی خۆی حەلی دەکات.
ئەگەر نووسینی کورتەچیرۆك بە وێنەگرتن بەراورد بکەین، کە چەندێك ناڕاستەوخۆ ئەم دوو هونەرە لێکەوە نزیکنو تەواوکەری یەکترین، وێنە لەگەڵ کورتەچیرۆکدا... لە شوێنو ساتێکی دەستنیشانکراودا مەبەستە لە کرتەکردن لەسەر دیمەنێکی هەڵبژێردراو کە خاڵی دەستنیشانکراو تەرکیزی کرابێتەسەر. (وێنەیەك لەبری هەزار وشە) ئەم وتەیە ڕۆژانە لە میدیاکاندا گوێمان لێی دەبێت، هەرچەندە زۆربەی وێنەکان بێجگە لە کاتو شوێن سادەو ڕوکەشن، بە ناوازە سادەییو ڕوکەشیش دەبنە سەرچاوەی ڕاستییەکان، زۆرێك لە وێنەکان تەنها کاتی گرتنیمان نیشانیدەدات، بەڵام زۆر وێنەش زۆر لەوە زیاترمان پێدەڵێن، هەڵبژاردن و لە چوارچیوەگرتنی دیمەنێك کە دەکرێت بڵێین بۆ ئەوەی ئەو دیمەنە بە وشە بکەین لە هەزار وشە زیاترمان پێویستە.
ئەگەر لەم وێنەیە بڕوانین دەست بەجێ دەیناسینەوە، وێنەیەك لە جەنگی ڤێتنام.
کچێکی مناڵ دەبینین بەڕووتی دەقیژێنێت و بەدەم گریانەوە ڕادەکات و باڵەکانی بڵاوکردوونەتەوە،

دیارە کە بەرەو ڕووی فۆتۆگرافەرەکە دێت، لە چواردەری چوار منداڵی تر دەبینین... ئەوان جلیان لەبەردایە، یەکێك لە منداڵەکان ئاوڕی داوەتەوە بۆدواوەو لەو چەندین سەربازە دەڕوانێت کە بە چەکەوە بەدوایانەوەن، پاشبنەمای وێنەکەش دووکەڵ و ئاسەواری کاولکاری دەبینین، هەر ئەوەندە دەبینین، کە دیمەنێکی بچوکە لە دیمەنی جەنگێکی گەورەو گران... هەڵبژاردەی دیمەنێك لە هەرازان دیمەنی ڕووداوەکانی ئەو جەنگە، چەندێك ئەم دیمەنە بەشێکی بچوکە لەو جەنگە، بەڵام ئەم وێنەیە بەتەنها لە کاتی خۆیداو تاکو ئەمڕۆیش، تەواوی جیهانی هەژاند، بێجگە لەوەی ئەو کچە ڕووتەی ناو وێنەکە بوو بە ئیکۆنێك بۆ جەنگی ڤێتنام.

دەتوانین بە کورتەچیرۆك بڵێین، پاکژ یان کورتکراوەی ڕووداوێك یان بەسەرهاتێکی دوورودرێژ، بۆ نموونە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ گەمەیەکی فوتباڵدا کە زیاتر لە ٩٠ خولەك دەخایەنێت، ئایا چاوی کامێرا لەو ٩٠ خولەکەدا چیمان نیشان دەدات، کە لە یارییەکی فوتباڵدا کاتو شوێنو کاراکتەرو چەندین جۆر کاراکتەری لاوەکی ئامادەیە، ئایا ئێمە چی دەبینین ئەگەر لە تەلەفزیۆندا لەو گەمەیە بڕوانین، کام یاریزان دەبێتە کاراکتەری سەرەکیو زۆرترین کات چاوی کامێرای لەسەرەو کێ دەبێتە کاراکتەری لاوەکیو کێ تەنها بۆ جارێك دووان دەردەکەوێك، ڕێك خەری ئەو دیمەنانە (مۆنتاج کەر) چ دیمەنێکمان بۆ هەڵدەبژێرێت.لەهەمانکاتدا ئەو گەمە ٩٠ خولەکییە دەتوانرێت کورتکراوەکەی نیشان بدرێت... بۆ ٣٠ خولەك یان کەمتر، گوڵ بژێرێك بکرێت لەنێوان دیمەنەکاندا، لێرەدا دیکۆر و هاندەرو یاریزانو نابژیوانو ڕاهێنەرو ئەو کەسەی کە لێدوان لەسەر گەمەکە دەدات... زۆر لەوە زیاتر، بێئەوەی لە کورتەکەیدا هیچیان فەرامۆش بکرێن، ئەگەر کورتەی ئەو گەمەیە لەگەڵ تەواوی گەمەکەدا بەراورد بکەین پێدەچێت هەمان زانیاریو لەزەتمان پێببەخشێت، ئەم نموونەیەش دەتوانین لەگەڵ کورتە چیرۆك و نۆڤێلەو ڕۆماندا بەراوردی بکەین.

**مۆراڵ یان پەیام**

بەڕای زۆرینە هەنوکە کورتەچیرۆك شتێك لە مۆراڵ ئامادەیەو بە مەبەست نووسراوە، زۆر لە کورتەچیرۆکەکان باس لە گرژی نێوان پاشو خراپ دەکەن، یان بەرەنگار بوونەوەی خراپ لە خراپدا، یان گرژی و بەرەنگاربوونەوەی خودی مرۆڤ خۆی لەگەڵ سێبەری خۆی یان چواردەوریدا، بێگومان ئەوەیش دەکەوێتە سەر ئەو هەڵبژاردەیەی کە





نووسەر دەیکات. بە قۆزینەوەی ئەو هەلانە بۆ مۆراڵ یان پەیامی چیرۆك، یانی پێویستە نووسەر لێزان بێت لە هونەری گێڕانەوەدا، ئەگەر نا ئەو چیرۆکە دەچێتە قاڵبی وتار یان هەواڵەوە، یانی نووسەری کورتە چیرۆك پێش هەمووشت، چاودێرە، موئەریخە، گێڕەرەوەیە. نووسەری کورتەچیرۆك دەبێت دەرفەتی ئەوە بە خوێنەر بدات کە بە ئیحساسی لەکاتی خوێندنەوەدا بەشدار بێت، نوسینی کورتەچیرۆك هەوڵە بۆ پۆڵێنکردنی هۆسەی ڕوداو، نەخشاندنی وێنەیەك لە ڕوداوەکانی ژیان، توڕەیی مرۆڤ بەرانبەر بە بوونی خۆی، بەرانبەر چاکی و خراپی خودی مرۆڤ خۆی، مەسەلەکە مۆراڵە کە بەردەوام خوێنەر ئەو پرسیارەی لادروست دەبێت: تۆ بڵێیت منیش وام بکردایە؟

**کاراکتەر**

کاراکتەری سەرەکی لە کورتەچیرۆکدا تا رادەیەك سنووردارە، یەك یان دوان، لە زۆرینەی کاتدا ئەگەر دوان یان سیان بن... هاوڕێو دۆستو هاوسەری یەکترینو پێکەوە و لەیەك کاتدا لە ڕوداوەکاندا ئامادەییان هەیە. بۆ نموونە لە چیرۆکێکی نووسەر (حەمەفەریق حەسەن)دا، چیرۆکی (کریسکەی ئاگر، تەپودووی دوکەڵ):

(دیارە چارەنووس ئێمەی لێرە بە گێرهێناوە.. حەمەمراد ڕووی تێکردم و بەئاهی ساردەوە وای وت. ئەمبولانسەکانیش لەپەسا خنکاو و سووتاویان دەگواستەوە. ئەو دەمەی هێزەکان وەربوونە نێو ئەو خەڵکە ئەوقبووە وە، قەول وابوو ئێمەیش لەیەك دابڕێین، وەلێ دوور و نزیك ئاگایشمان لە یەك بێت، تاکو هیچ نەبێت، ئەگەر یەکێکمان... ئەوی وتمان، هەواڵەکە بگەیەنێتە کەسوکاری.)

دوو کارکتەری سەرەکی لەم چیرۆکەدا بەشدارن، ئەو دوو کاراکتەرە هاوڕێنو لە یەك کاتو شوێندا پێکەوە بەشدارن لە ڕوداوی ناو چیرۆکەکەدا، هەرچەندە یەکێکیان زیاتر لەوی دیان سەرەکی ترە... ئەویش بەهۆی ئەوەی کە گێڕەرەوەی ڕوداوەکانە، ئەم چیرۆکە نمونەیەکیشە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی پێشوومان: (بە ڕووداو دەست بە نووسینی چیرۆکە کەم بکەم یان بە کاراکتەر و ناساندنی کاراکتەر؟) کە لێرەدا نووسەری ئەم چیرۆکە هەردووکیانی پێکاوە.

هەم ناساندنی کەراکتەر و هەم ڕووداو. بێگومان نووسەری کورتەچیرۆك بواری ئەوەی نییە کە فۆرمێکی دیاریکراو بداتە کاراکتەر، هەر بۆیە زۆرینەی کاراکتەرەکانی ناو کورتەچیرۆك هاوشێوەن، سەختی نووسینی کورتەچیرۆك لێرەدایە، کە نوسەر لەڕێگای دیالۆگەوە یان بەرکەتنیان لەگەڵ ڕوداوەکاندا دەتوانێت، دەنگو ڕەنگی تایبەت بە هەر کاراکتەرێك بدات، لە نووسینی کورتەچیرۆکدا بوار نییە بۆ گەشەکردنی کاراکتەرو وەسفی پاشخانی کاراکتەر زۆر جار نووسین دەکات بە پۆترێتی یەکێك لە کاراکتەرەکان.

**پلۆت، گرژی، ڕێکخستن**

کورتەچیرۆك دەکرێت لێی بڕوانین وەك چۆن ئەمریکییەکان پێی دەڵێن (پارچەیەك یان دیمەنێك لە ژیان)، هەموو چیرۆکێك پێویستی بە ڕوداوە... دیمەنی ڕووداوێك لە ژیانی کاراکتەری سەرەکی لەگەڵ چواردەوریدا یان لەگەڵ کاراکتەرەکانی تردا. بێگومان بێ ڕوداو ناتوانرێت گرژی پلۆت بەرهەم بهێنرێت، نوسەر دەبێت لە سێ تا چوار هەزار وشەدا ڕوداو ڕێك بخاتو فۆرمی پێ ببەخشێت. خێرا خوێنەر بگەیەنێتە سەر خاڵی مەبەستە و دەست گیرۆیی و زیادەڕۆیی نەبێتە هۆکاری هەژاری و بە ڕووی پلۆتەوە دیار بێت و خوێنەر نەگەیەنێتە دوا وێستگەی مەبەست. زۆرێك لە نووسەرە ناودارەکان، لە کاتو شوێندا دەستگیرۆیی دەکەن، زۆر کات بە ڕوداو دەست پێدەکەن و پێشبینی یان بنەما خۆشکردن بۆ هۆکاری ڕوداو فەرامۆش دەکەن، بەم تەکنیکە دەتوانرێت دەستگیرۆیی لە کاتو شوێندا بکرێت، بێگومان لە زۆرینەی چیرۆکی مۆدێرندا... چۆنیەتی بەرپا بوونی ڕووداوێك درێژەی ئەوتوی پێنادرێت.

ستەرەکتووری کورتەچیرۆك پێویستە توندوتۆڵ دابڕێژرێت... بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆکاری پچراندنی هێڵێك لە هێڵەکانو دیالۆگو دیمەن لاواز دەکات.

**هاوسەنگی**

- سنووردار کردنی کاراکتەری سەرەکیو لاوەکی.
- سنووردار کردنی یاری کردن بەکاتو شوێن، زانیاری پێویستو کورت لەسەر شوێنو کاراکتەر.
- دیالۆگ و مەنەلۆگی پێویست.
- گێڕەرەوە یان ڕاوی، گۆڕینی ڕاوی سنوردار بکە، بێگومان نوسەر لێرەدا ئازادە.

**جیاوازی نێوان کورتەچیرۆک و ڕۆمان**

سنوری درێژبوونەوەی کورتەچیرۆك لە شەش هەزار وشە تاکو چواردە یان پازدە






هەزار وشەیە، کورت ترینیش لەسەروو سەد وشەوە... کەمترو زیاتر، بەبەراورد لەگەڵ ڕۆماندا کە زۆرینەی ڕۆمانەکان لەسەرو چل هەزار وشەوەن، بێگومان نووسەر لێرەدا سەرپشکە کەی چیرۆکێکی بە ڕۆمان ناوزەد دەکات (بەتایبەتی لە ئەدەبی کوردیدا). جیاوازی نێوان کورتەچیرۆك و ڕۆمان تەنها لە قەبارەدا نییە، ڕۆمان تەمەنێکە لە نەشو نمای کاراکتەر لە زەمەنێکی درێژدا، هەرچەندە ڕۆمانگەلێکی زۆر هەن ڕووداوەکانیان لە فەترەزەمەنییەکی زۆر کورتدا ڕوودەدەن، بۆ نموونە ڕۆمانی (ڕوداو)ی نووسەری بەلجیکی (توم لانوا) کە تەواوی ڕوداوەکانی ئەو ڕۆمانە لە کاتژمێرو نیوێکدا ڕودەدەن، چەندین هێڵی لێدەبێتەوەو بەڵام یەك یەك هێڵەکان دەگەڕێنەوە سەر هێڵی سەرەکی و سەرجەم لە ڕابردووە دەگەڕێنەوە بۆ ئێستای ناو ڕۆمانەکە، ڕۆمانێك کە چەنین کاراکتەری سەرەکی و لاوەکی بەشدارن پێکەوە لە ڕووداوەکاندا، لە کورتەچیرۆکدا ژمارەی بەشداری پێکردن یان ناوهێنانی کاراکتەر سنورداره بەهۆی کورتی تێکست، باشترە بڵێین، کەمی کاتو تەزیقی شوێن. لە ڕۆماندا ڕودواوو بەرلێکەوتنەکان بێشومارنو هەموو دیمەنێك بەردەوام لە گەشەکردندایە، لە کورتەچیرۆکدا ڕوداوەکان لە چەند دیمەنێك تێناپەڕن و نووسەر کورتەکەیان تۆمار دەکات.

چەندین کورتەچیرۆك یان ڕۆمان خوێندنەوەیان بۆ کراوەو کەوتونەتە بەر ڕەخنەی ڕەخنەگران... ئەگەر ئێمە بەدیقەتەوە سەرنج لەو خوێندنەوەو ڕەخنانە بدەین، بڕگەو دیمەنەکانی کورتەچیرۆك لە کۆی ئەو نوسینانەدا دەناسینەوە، بەهۆی خێراو کورتی ڕوداوەکانو کورتی یان جۆری وەسف کردنیان، لە کورتەچیرۆکدا خاڵی پێك گەیشتنەکان بە کورتە ڕیدا دەبرێن، یەك لە دوای یەك دەبنە تەواوکەری یەکترو فۆرمێکی یەك پارچەیی پێك دەهێنن، لە ڕۆماندا بە پێچەوانەوە نوسەر دەتوانێت کۆی زانیارییەکان بەسەر تەواوی درێژی ڕۆمانەکەدا دابەش بکات بێ ئەوەی کاریگەرییان لەسەر پلۆت یان کاراکتەر هەبێت.

سەرچاوە:

گۆڤاری کتێب (boek.nl).

قوتابخانەینووسەروهونەرینوسین/خرۆنیگن، هۆڵەندا (دەرسی مامۆستای هونەری چیرۆك نوسین: ئەیسۆپۆست)، (schrijversvakschool/groningen).



# شانۆی پۆست مۆدێرنیزم

## تێڕوانینێك لە هەوڵە مۆدێرنەكانی شانۆ

**دانا ڕەئووف**

### دەستپێک

شانۆی مۆدێرن و پۆست مۆدێرنیزم ڕەگ و ریشەیەکی دێرینی هەیە و بە بێ گەڕانەوە بۆ ئەو ڕەگ و ریشەیە، ناکرێت لە ستراکتور و بنەما هونەری، هزری و ئێستاتیکییەکانی بگەیت. هەموو سەدە و سەردەمێکیش لە ڕووی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی، فەلسەفی، هونەری، ئاکاری، سیاسی و سیکۆلۆژییەوە، کاریگەرییان لەسەر فۆرمەلەکردنی چەمکەکانی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم هەبووە. هەر بۆ نموونە لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٠٠کانەوە لەژێر کاریگەرێتی ئەم گۆڕانکاریانەوە، تەوژمێکی جیاوازی ئەدەب و هونەر بڵاو دەبێتەوە.

جەنگی جیهانی یەکەم، گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەڕووی بنەما کۆمەڵایەتیەکان، بازرگانی، هۆکارەکانی گواستنەوە، بوارەکانی زانیاری و تەکنیکەوە بەرپا کرد، ئەم گۆڕانکارییانەیش هەل و مەرجەکانی دونیایان بە تەواوی گۆڕی. دیارە ئەدەب و هونەریش بەدەر نەبوون لەم گۆڕانکاریانە و چەندین دەرگایان بە ڕوودا کراوەتەوە، هەروەها بوارەکانی زانستە مرۆییەکانیش هەنگاوی گەورەیان ناوە. نابێت ئەویشمان لەبیر بچێت، کە کاریگەرێتی لێکۆڵینەوە دەروونیەکانی پزیشکی دەروونی سیگمۆن فرۆید ١٨٥٦-١٩٣٩ لە بوارەکانی نەست و بەهاکانی خەوندا بەسەر ئەدەب و هونەرەوە، بە تایبەتیش لەم قۆناخەدا زۆر گرینگ بوون.

## سرووشت و سەرچاوەکانی ئەدەب

بەر لەم قۆناغە و لەکاتی گەشەکردنی ڕۆمانتیکیەتدا سرووشت ببووە سەرچاوەی سرووش بۆ نووسەر و هونەرمەندان و دۆزینەوەی ئامرازی نوێ و ڕێگا کردنەوە بۆ دیاردەیەکی تازە لە ئەدەب و هونەردا. لەم ڕەوشەیشدا




ڕۆمانتیکییەکان ئەوەیان دووپات دەکردەوە، کە ژیانی ڕۆژانەمان لە خەونەکانماندا جوانتر دەردەکەون وەك لەژیانی راستەقینەدا. ئەمەیش لە بەرهەمی نووسەر و هونەرمەندەکانی سەر بەم ڕێبازەدا بە ڕوونی دەردەکەون. ئەم دیدە هونەری و لە هەمانکاتدا فەلسەفییەی ڕۆمانتیکییەکان بووە بنەمایەکی فیکری گەورە بۆ بیروبۆچوونەکانی کەسێکی دەروونناسی وەك فرۆید هەر لەم دەروازەیەشەوە سوریالیەکان هێدی هێدی لەفەرەنسا دەرکەوتن، بێگومان تەوژمی هونەرمەندەکانی سەر بە ڕێبازی ئێکسپرێشیونیزمیش دەرکەوتەیەکی گرینگی تری ئەم قۆناغەیە.

## سەرهەڵدانی درامایەکی مۆدێرن

هەر لەسەرەتای ساڵەکانی ١٩٠٠کاندا درامایەکی مۆدێرن سەرهەڵئەدات؛ لە ناتورالیزمەوە بۆ ڕیالیزم و دواتریش سیمبولیزم. ڕێبازی ریالیزم و سیمبولیزم لەشانۆنامەکانی هێنریك ئیپسن و ئاگۆست ستریندبێرگ دا گرینگترین دیاردەکانی ئەو تەوژمە مۆدێرنەیە. ئەم دوو شانۆنامەنووسە هەردووکیان لەباکوری ئەوروپاوە، نەرویژ و سوید، دەرکەوتن و کاریگەرییان بەسەر تێکڕای درامایەکی مۆدێرنی ئەوروپیەوە دەبێت. بەڵام تەوژمە سیمبولیزمەکە لەناوجەرگەی

ئەوروپاوە دەركەوت؛ نووسەری گەورەی بەلچیكی مۆریس مەتەرلینگ ١٨٢٩-١٩٤٩ بە هێماگەل و وێنە و ئاماژە و بێدەنگی، دەقەكانی ڕۆدەنێت و دەبێت بە گرینگترین ناوی دراما و شانۆیەكی سیمبولی. بەرهەمەكانی ئەم نووسەرە لەفەرەنساوە، وەك مەڵبەندێكی گرینگی رۆشنبیری ئەودەمە، زۆر بەخێرایی بڵاوبووە و كاریگەرییەكانیشی بووە سەرەتایەكی پتەوی شانۆیەكی سیمبولیزم لەئەوروپادا. شانۆنامەكانی ئەم نووسەرە، بۆ نموونە "كوێرەكان" و پێلیس و مێلاندە... هتد دەبنە كەرەسەیەكی دەوڵەمەندی تەوژمە سیمبولیزمەكانی فەرەنسا و دواتریش شانۆكارانی وەك ستانیسلاڤسكی و مایرهۆڵد لە ڕووسیا. مەتەرلینگ تەكنیك و شانۆی بووكەڵە زۆر سەرنجی ڕادەكێشێت، لەم شانۆیەدا هێما ڕۆڵ دەبینێت و لە تەوژمەكانی واقیعیەت و سرووشتگەرایی دوورە و هەر لە فۆرمەكانی شانۆی بووكەڵەوە چەمكە سیمبولیزمەكانی خۆی دەدۆزێتەوە.

## شانۆی ڕووسی و سەرەتاكانی مۆدێرنیزمە

شانۆی ڕووسی لە هەردوو ڕووی دراما و دید و تەكنیك و بنەماكانی هونەری شانۆوە، ڕۆڵێكی گرینگیان لە بەرەوپێشەوەچوونی چەمك و فەلسەفەی مۆدێرنیزمە و پۆست مۆدێرنیزمدا دیووە، بۆ نموونە ڤلادیمیر مایكۆڤسكی١٨٩٣-١٩٣٠ بە دەقە ئەڤانگارد و بۆچوونە ڕادیكاڵەكانی، یاریدەدەرێكی گەورەی مایرهۆڵد دەبێت و ڕۆڵێكی گەورە دەگێڕێت. یەكێك لەدەنگە



هەرە گرینگەكانی تری مۆدێرنیزم لەشانۆ و درامای ڕووسیدا، ئەنتوان چێخەف ١٨٦٠-١٩٠٤ـە. هەرچەندە دەقەكانی چێخەف بەدواچوونێكی قووڵ و ڕیالیزمیانە بۆ ژیانی مرۆڤ دەكات، بەڵام سیمایەكی سیمبۆلیزمیان پێوە دیارە و هەروەك مەتەرلینگ بە قووڵی لە ئەنجامەكانی هێماگەل دەگات و لەنێو ستراكتورە ڕیالیزمەكەیدا بەرجەستەیان دەكات. چێخەف بەوپەڕی رێز و ستایشتەوە دەیڕوانییە ئیپسن؛ شانۆنامەی (نەورەس)یش بەشێوەیەك لەشێوەكان كاریگەری چەمكە سمبولیزمەكانی ئیپسنی پێوە دیارە، بەتایبەتیش لەبەكارهێنانی سیمبولی باڵندە دا. باڵندە، لە شانۆنامەی "مراوی كێوی" ئیپسندا،وەكوو سیمبولێكی گرینگ دەردەكەوێت؛ چ كارەكتەرێكی شانۆنامەكە هێمای مراوییەكی كێوییە و مراوی كێوی دەبێتە چ هێماگەلێكی شانۆنامەكە؟ ئەمە و كۆمەڵێك پرسیاری تر، كە ئیپسن وەڵامیان نەداتەوە و بۆ بینەرانیان بەجێ دەهێڵێت.



شانۆی رووسی لەم قۆناغەدا گۆڕانکاری گرینگ و هەنگاوی بەرچاوی، لەسەر هەردوو ئاستەکە، دراما و هونەری شانۆ، زۆر بەخێرایی دەنا. چێخەف بە دەقەکانی و ناوەندێکی گرینگیش بۆ نوێکردنەوەی شانۆ، لەشانۆی هونەری مۆسکۆدا خۆی بینییەوە. بێگومان هونەرمەندێکی گەورەی وەك کۆنستانتین ستانیسلاڤسکی ١٨٦٣-١٩٣٨ رۆڵێکی گەورە و فراوانی لەم بوارەدا هەبوو، ستانیسلاڤسکی هەموو رێگاکان تاقی دەکاتەوە: سەرەتا ناتورالیزم، ریالیزم و دوای ئەوەیش لەدەروازەی شانۆنامەکانی ئیپسن و مەتەرلینگەوە روودەکاتە شانۆیەکی سیمبولیزم. ستانیسلاڤسکی دواتر زیاتر لەڕوانگەی شانۆنامەکانی چێخەفەوە برەو بە سیستێم و ڕێبازەکەی خۆی دەدات، بەڵام ستانیسلاڤسکی بەشێوەیەکی گشتی بە سیستێمەکەی، سەبارەت بە - پێگەیاندنی ئەکتەرو هونەری نواندن - ناسرا، وەك لە ئەکتەر و ریژیسۆر. ستانیسلاڤسکی تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە شانۆی هونەریی مۆسکۆ برەو بە کار و پرۆژەکانی دەدات و هاوکارییەکی زۆری مایرهۆڵدیش لە شانۆی-ستۆدیۆ دەکات.

## شانۆی ئێکسپرێشونیزم

سەرهەڵدانی شانۆیەکی ئێکسپرێشیونیزم لەشانۆی هاوچەرخی جیهانیدا، دەبێتە وێستگەیەکی گرینگی چەمك و شێوازەکانی مۆدێرنیزم. ستریندبێرگ بەشانۆنامە ئێکسپرێشیونیزمەکانی، وەکوو خەونەنمایشێك، بەرەو دیمەشق و شانۆنامەکانی "ژوورەنمایش" بە تایبەتیش - کەڵك و سۆناتای تارمایی - قۆناغێکی گرینگی ئەم بوارە دەبرێت و دەروازەیەکی بەرین بە ڕووی ڕەووتی شانۆی ئەوروپیدا دەکاتەوە. ئەم تەوژمەیش هەوڵیدا لە ڕوانگەی دراماوە گوزارشت لەسەر هەموو ئاستەکان، بەتایبەتیش لە لایەنە شاراوە و قووڵەکانی ژیانی مرۆڤەوە بکات. ئەمەیش لەو سەردەمەدا تەوژمێکی راستەوخۆی بەهێزی دژ بە ڕێبازی سرووشتگەرایی و ناتورالیزم بوو، هەروەها سەرەتایەکی گرینگیش بوو بۆ شانۆیەکی مۆدێرن و جیاواز.
بە پێچەوانەوە ناتورالیزم یان سرووشتگەرایی، لە تەقەلای خستنەڕووی رووکارەکانی دەرەوەی ژیاندا بوو، بەڵام ئێکسپرێشیونیزم "دەربڕین" لەتەقەلای بەرجەستەکردنی لایەنە نادیارەکانی ژیان و نەستی مرۆڤدا بوو. هەر لەم رووەوە، بۆ نموونە هونەری سینۆگرافیا و رۆڵی ریژیسۆر و داڕشتە و فەلسەفەیەکی وێنەیی بووە چەمکەکانی ئەم شانۆیە و لەهەمانکاتدا

دابڕانێکی سەرانسەری لەگەڵ سرووشتگەرایی و ریالیزمدا دروست کرد. شانۆی ئێکسپرێشیونیزم زۆر بەخێرایی بە هەموو جیهاندا بڵاوبووەوە، جگە لە ستریندبێرگ، نووسەری ئەمەریکی ئۆژین ئۆنێل ١٨٨٨-١٩٥٣ لەم بوارەدا رۆڵێکی گرینگ و لە بەرچاویان هەبووە، شانۆنامەی "غۆرێلا"ش نموونەیەکی بەرزی شانۆیەکی ئێکسپرێشیونیزمی ئۆنێل و شانۆی ئەمەریکیشە. ئۆنێل بەم دەقەی و هەندێك لە دەقە شانۆییەکانی تری، وەك "پرسە شایەنی ئێلێکترایە" و "لەودیوو ئاسۆگەوە" توانی لە ڕیالیزم و ڕیالیزمی سیمبولیزمەوە بپەڕێتەوە بۆ شانۆیەکی بەرزی پڕ لە هێما و ئێکسپرێشیونیزمێکی باڵا بخوڵقێنێت. هەرچەندە ئۆنێل کەوتبووە ژێر کاریگەرییەکی بەهێزی ستریندبێرگەوە، بەڵام توانی هەروەك ستریندبێرگ ببێتە شانۆنامەنووسێکی گەورە، کە چ لە بواری ڕێبازی ڕیالیزم و چ لە بواری شانۆیەکی ئێکسپرێشونیزمدا جێگای خۆی لە سەر نەخشەی شانۆی جیهانیدا بکاتەوە.

## ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی دووەم

شۆڕشی ئێکسپرێشیونیزم لەشانۆدا، سەرەتایەکی پتەو بوو بۆ تەوژمە ئەزموونگەری و دواتریش ئەدەبی ئەپسوردیزمی پەنجاکانی سەدەی رابردوو. دوای جەنگی جیهانی دووەم ڕێبازی ئەپسۆردیزم لەهەموو تەوژمەکانی تر زیاتر دەرکەوت؛ کە بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٥٣دا شانۆنامەی "بەدەم چاوەڕوانی گۆدۆوە" نەمایش کرا، زایەڵەی زەنگی ڕێبازێکی نوێ، شێوازێکی جیاواز و فۆرم و فەلسەفەیەکی تری مۆدێرنیزم دەنگی دایەوە. بێگومان نووسەری ئێرلەندی ساموێل بێکێت ١٩٠٦-١٩٨٩ پێشڕەوی ئەو قۆناغە نوێیەی دراما و شانۆیەکی مۆدێرنی جیهانی بوو. بێکێت رێگای بۆ کۆمەڵێك شانۆنامەنووسی تری نەوەکەی خۆی خۆشکرد، لەوانەیش یوژین یونسکۆ ١٩٠٩-١٩٩٤ یونسکۆ بەشانۆنامەی "کورسیەکان" کە لەساڵی ١٩٥٦دا بۆ یەکەمجار نەمایش کرا، مەودایەکی گەورەتر و بەرەوامییەکی پتەوی بە بزووتنەوەی شانۆی ئەبسۆرد بەخشی. ئەوەی جێگای سەرنجە چ لەلای بێکێت لە "بەدەم چاوەڕوانی گۆدۆوە" و چ لەلای یۆنسکۆ لە "کورسیەکان"دا، بێگومان دەقەکانی تریشیان، زمان بەشێوەیەکی جیاواز مامەڵەی لەگەڵ کراوە و ئەو زمانە لۆژیکییەی شانۆی ریالیزم کاری لەسەر دەکرد، بەتەواوی تێك دەشکێنرێت. لەبری ئەوە زمانێکی جیاواز: وشەی پچڕ پچڕ، ڕستەی ناتەواو، دەستەواژەی کورت، بێدەنگی، دووبارەبوونەوە ... هتد دەبێتە بەشێك لە تەکنیك و بنەما هزرییەکانی ئەم نووسەرانە. بێجگە لە



یونسکۆ ژان ژینییە ١٩١٠-١٩٨٦ و ئارتور ئەدامۆڤ ١٩٠٨- ١٩٧٠ دوو نووسەری تری گرینگی ئەم بوارەن. دابڕانی مرۆڤ، تەنهایی، کاریگەرییەکانی جەنگ و بێ هیوایی، نامۆبوون لە خۆ و لە خێزان و کۆمەڵگا، دەبن بە بەشێك لە بنەما فیکری و فەلسەفیەکانی ئەم نووسەرانە.

مایرهۆڵد وێستگەیەکی گرینگی مۆدێزنیزم هەر لەسەرەتای بیستەکاندا بزووتنەوەیەکی شانۆی مۆدێرن، بەتایبەتی دوای تەقەلا زۆر ناتورالیزمیەکانی شانۆی سەربەست و ئەندریە ئەنتوان لە پاریس، دەرکەوت. ئەو بزووتنەوەیەیش گەشەکردن و بەردەوامیەکی راستەوخۆی شانۆی هونەری مۆسکۆ بوو. هەر لە بیستەکاندا ریژیسۆرێکی گەورەی وەك ڤیسیڤۆڵد مایرهۆڵد ١٨٧٤-١٩٤٢ دەرکەوت، ئەم هونەرمەندە تەکنیکی بیۆمیکانیکی بۆ مەشق و ڕاهێنانی ئەکتەر داهێنا و هەوڵیدا بگەڕێتەوە بۆ سەر بنەما گەوهەری و سەرەتاییەکانی شانۆی گرێکی کۆن، شانۆی رۆژهەڵاتی بە تایبەتیش شانۆی چین و ژاپۆن، هونەری پانتۆمایم، کۆمێدیای دیلارتی، شانۆی منداڵان... هتد. هەر لەم ڕووەوە بنەما ئێستاتیکیەکان، بۆ خوڵقاندنی شانۆیەکی نوێ و جیاواز، تووخمێکی گرینگی مێتودی کارەکانی مایرهۆڵد بوو. مایرهۆڵد ئەوەی بە تیۆر و پراکتیك دووپات دەکردەوە، کە سرووشتگەراییەکان و ڕێبازە ڕیالیزمییەکەی شانۆی هونەریی مۆسکۆ بنەما گەوهەریی و سەرەکییەکانی شانۆیان لەبار بردووە و شانۆیان لە ڕووی تەکنیکی ریژی و نواندنەوە بەرەو ڕێگایەکی داخراو بردوە. ئەم فۆرم و شێوازی کارکردنەی مایرهۆڵد، کە بێگومان ناچێتە چوارچێوەی ڕیالیزمی سۆشیالیزمەوە، نابێتە جێگای سەرنجی رووسیای ستالین، بۆیە دەگیرێت و زۆر بەئاسانی ئەو هونەرمەندە گەورەیە دوردەخرێتەوە و دواتریش تیرۆر دەکرێت.

## مۆدێرنیزمی ئەڵمانی

لە ئەڵمانیا ماکس ڕاینهارت ١٨٧٣-١٩٤٣ و ئێرڤین بیسکاتۆر ١٨٩٣-١٩٦٦ درێژەیان بە ڕێبازەکەی مایرهۆڵددا، بەڵام شانۆکەی بیسکاتۆر دواتر ڕێچکەیەکی تری وەرگرت و بووە شانۆیەکی رامیاری و مەبەستی بوو، کە لەڕێگای چەمك و فۆرمەکانی شانۆی دۆکیومێنتاریی و تۆمارییەوە هانی چینی پرۆلیتاریا بدات تا شۆڕش هەڵگیرسێنن. بیسکاتۆر تەکنیکی



سینەمای هێنایە ناو شانۆوە و هەوڵی ئەوەی دەدا، سەر تەختەی شانۆ و هۆڵی بینەران پێکەوە ببەستێتەوە و ڕۆڵێکی تر ببەخشێت بە شانۆ. بیسکاتۆر لەسەرەتای ساڵەکانی ١٩٣٠دا و لەڕێگای سویسراوە ئەڵمانیا بەجێ دەهێڵێت و دواجار لە تاراوگەی ئەمریکا دەگیرسێتەوە. ڕاینهارتیش ڕۆڵێکی گەورەی لە داهێنان و گەشەکردنی ئامرازە شانۆیی و کردەییەکانی هونەری شانۆ و تەکنیکی تەختەی شانۆدا گێڕاوە، بۆ نموونە داهێنانی تەختەیەکی شانۆی بزۆز، کە لە کاتی پێویستدا و بۆ گۆڕینی دیمەنەکان خولاوەتەوە. لەم زنجیرە گۆڕانکارییە بنەڕەتیانەی شانۆی هاوچەرخدا یان مۆدێرندا، برتۆڵد برێشت ١٨٩٨-١٩٥٦ دەبێتە بەشێکی زۆر گرینگ و کاریگەر؛ برێشت توانی لەڕێگای شانۆ داستانی و فێرگەییەکەیەوە هەناسەیەکی نوێ ببەخشێتە هونەری شانۆ. هەرچەندە ڕەگ و ڕیشەی شانۆی داستانی یان تەکنیك و فەلسەفە شانۆییەکەی برێشت دەگەڕێتەوە بۆ مایرهۆڵد و دوای ئەوە بەردەوامیەکی راستەوخۆی بیسکاتۆر. بەڵام برێشت داهێنەری یەکێك لە گرینگترین تەکنیك و چەمکەکانی شانۆی هاوچەرخە، کە بە "نامۆبوون" ئاماژەی بۆ دەکرێت و شانۆی داستانی برێشتی لە چەمك و بنەماکانی شانۆی ئەریستۆ جیا دەکاتەوە، ئەم چەمکە ئێستێتیکیەیش تێگەیشتنی هاوکێشە و پرۆسە شانۆییەکانی بەتەواوی گۆڕی. برێشت بۆ پراکتیزەکردنی ڕێبازە شانۆییەکەی خۆی کۆمەڵێ دەق و شانۆنامەی زۆر گرینگیش دەنووسێت، لەوانە: ئۆپێرای دوانزە قورشی، دایکە ئازا و منداڵەکانی، بنەما و دەرەکی، مرۆڤی پاك، پۆنتێلا و ماتی، بازنەی تەباشیری قەوقاز، ژیانی گالیلای... هتد. پیتەر بروك لەکتێبی پانتایی بۆش دا گرینگییەکی زۆری بە برێشت داوە و بە کلیلی شانۆی هاوچەرخی دادەنێت. هەروەها بروك ئاماژە بۆ ئەوەیش دەکات، کە زۆر گرانە بۆ هەر یەکێك بەڕاستی لە بواری شانۆدا کاردەکات، ئاوڕ لە برێشت نەداتەوە. بروك دەیەوێت کلیلی مۆدێرنیزمەی شانۆی هاوچەرخی جیهانی ببەخشێت بە برێشت و لە تەکنیکی نامۆبوونەوە چەمکی شانۆیەکی مۆدێرن بۆ شانۆی جیهانی دەستەبەر بکات.

## کۆمەڵگایەکی گلوبالیزم و شانۆیەکی پۆست مۆدێرنیزم

ئەمڕۆ واقعیی مرۆڤی هاوچەرخ یان مرۆڤی ئەم سەردەمە پۆست مۆدێرنیزمە، شان بەشانی گلوبالیزم و گۆڕانکارییە خێراکانی تری جیهان، ڕووبەڕووی جۆرێکی جیاوازی هونەر و شانۆ بۆتەوە. شانۆیش لەگێژاوی ئەم گۆڕانکاریە خێرایانەدا، بەهەمان شێوە هەنگاوی خێرای ناوە؛ لە"ئەڤانتگەرتەوە" بۆ "پۆست مۆدانیزم" و لەوێشەوە بۆ فۆرم و شێوازەکانی "پێرڤۆر مێنس".



مرۆڤی ئەم سەردەمە بەبێ هیچ گیروگرفتێك لە نێوان ئاكار و ترادیشونە تەقلیدییەكان و تێپەڕاندنی ئەو ئاكارانەدا هاتووچۆ دەكات. ئەوەی جێگای ئاماژە بۆ كردنیشە ئەوەیە، كە لەم پرۆسەیەدا دید و ناوەرۆكی شتەكان، یاخود دەقەكان، ئاستی نەمایشەكان دیاری ناكات، بەڵكو خودی نەمایشەكان گەمەی پرۆسەكە دەخاتەگەڕ. دەقە شانۆییەكان لە پرۆسە پۆست مۆدێرنیزمەكاندا هەڵدەوەشێنرێن و سەرلەنوێ لە بوونیادی نەمایشەكاندا، بە شێوەیەكی تر ڕۆ دەنرێتەوە و گێڕانەوەی چیرۆكەكە زەمەنێكی خەونەئامێز لەخۆدەگرێت. ئەوەی پۆست مۆدانیزمەكان لە شانۆدا باسی دەكەن، سەرەتاكەی بەشێوەیەك لەشێوەكان دەگەڕێتەوە بۆ دید و بیروبۆچوونەكانی ئەنتۆنین ئارتۆ ١٨٩٦ـ١٩٤٨ و دواتریش گرۆتۆڤسكی ١٩٢٢ـ١٩٩٩ ئەو دیدە جیاوازە شانۆییانە، ئەمڕۆ لە پرۆسەی بەرەوپێشەوەچوونی زەمەندا گەیشتونەتە قۆناغەكانی پۆست مۆدێرنیزم.

هەروەها یەكێك لەناوەندە گرینگەكانی شانۆیەكی پۆست مۆدێرنیزم شكاندنی هەموو بەربەستە تەقلیدییەكان و گەمەكردنە بەو سنورە داڕێژراوەی، كە لە نێوان بینەر و تەختە شانۆدایە. جووڵانەوەی پۆست مۆدێرنیزم لە حەفتاكاندا سەری هەڵداوە و ئەمڕۆیش گەیشتۆتە ئاستێكی بەرز، ڕیژیسۆری ئینگلیزی "رۆبێرت ویلسون" و "رۆبێرت لێباش"ی كەنەدی دوو دەنگی گرنیگی شانۆیەكی پۆست مۆدێرنیزمن. ئەم دوو ڕیژیسۆرە بەردەوام لەسەر زۆربەی شانۆی وڵاتە ئەوروپییەكان كاردەكەن و پلاتفۆرمێكی پۆست مۆدێرنیزمیان بۆ شانۆی ئەوروپی خوڵقاندووە و كاریگەرییەكانیشیان بەسەر شانۆكارانی دونیا و ڕەوتی شانۆی جیهانییەوە بە ڕوونی دیارە.

لە شانۆی پۆست مۆدێرنیزمدا ئاستێكی گرینگی جیاوازتر لە پرۆسە شانۆییەكاندا دەبەخشرێتە پێگە و بەهای بینەران و لە دووتوێی كۆمەڵە ڕووداوێكی ناتەبا، نالۆژیكی و كۆلاشئاسادا، بینەر و شانۆ هەموو پەیوەندییە تەقلیدیەكانی خۆیان لەدەست دەدەن. كارەكتەرەكان، هەریەكە وەك خودی سەربەخۆ و دوور لە یەكتری و لە دەرەوەی بازنەی پەیوەندییەكانەوە، بەوپەڕی سەربەستییەوە دەجوڵێنەوە.

ستراكتۆرە بنەڕەتییەكانی ئەم شانۆیە، وێنەییە و كردەی بینین ڕۆڵێكی گرینگتری هەیە وەك لە كردەی گوێگرتن. هەر لەم بنەمایانەیشەوە دەتوانین بڵێن، كە شانۆی



پۆست مۆدێرنیزم گەڕانەوەیە بۆ بنەما ریتواڵی و داستان و ئەفسانەکان، بەڵام بە ئاڕاستەیەکی تر و پێچەوانەدا.
جگە لەو دوو ریژیسۆرەی لەلای سەرەوە ئاماژەم بۆ کرد، کۆمەڵێ گروپی تری گرینگیش لە وڵاتەکانی ئەوروپادا هەن، بۆ نموونە گروپی **Tg Stan** کە گروپێکی بەلچیکییە، لەم بوارە مۆدێرنەی شانۆدا هەنگاوی گەورە و فراوانیان ناوە. ئەم گروپە بە هەناسەیەکی پۆست مۆدێرنیزمی درێژخایەن کاردەکەن، یەکێك لەنەمایشە گرینگەکانی ئەم چەند ساڵەی دواییان شانۆنامەی (**Poguelin**) بوو، کە لە هەشت شانۆنامەی جۆراوجۆری مۆلییرەوە ئامادەیان کردووە. ئەم گروپە لەم نەمایشەدا لەسەر تێکشکاندنێکی تەواوی زمانی دەقەکان کاریان کردووە و زمانێکی مەجازی تەکنیکی و فۆرمێکی نزیك لە پێرفۆرمێنسیان بە کارهێناوە.
ڕەخنەگرەکان لە شرۆڤەی ئەو مەسەلەیەدا ئەوەیان دووپات کردۆتەوە، کە بەکارهێنانی زمان و بەو شێوەیە، بووبووە یەکەیەکی گرینگی نمایشەکە؛ وشەی پچڕ پچڕ، بەکارهێنانی ڕیتواڵ، مۆسیقا، دەنگی جیاواز، ریتم، تەرتیلەی دینی و فۆلکلۆری و دابەشکردنی دەیالۆگەکان... هتد. ئەمە تەنها نموونەیەکە لەنێوان هەزارەها نموونەی پرۆژە پۆست مۆدێرنیزمەکاندا و مەسەلەی پۆست مۆدێرنیزمیش گەیشتۆتە کۆتایی گێڕانەوەی چیرۆکە گەورەکان. ئەوەی گرینگە لەم نەخشە نوێیەدا ئاماژەی بۆ بکرێت، ئەوەیە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، تەنانەت هەموو جۆرە ئایدۆلۆژیەتێکیش بەهاکانی خۆی بەتەواوی لەدەست داوە.
ئەکتەر و هونەری نواندنیش لەم پرۆسە پۆست مۆدێرنیزمەدا جێگای سەرنج و بایەخ پێدانە؛ ئەکتەرەکان بەهیچ شێوەیەك رۆڵی یان کارەکتەری ترادیشۆنی نابینن، بەڵکو لەبری ئەوە زۆر بەڕوونی و ئاشکرا بە بێلایەنی و دوورەپەرێزی مامەڵە لەگەڵ رۆڵەکانیان دەکەن. هەندێك لەڕەخنەگرە ئەوروپییەکان، بەزمانێکی گاڵتەئامێزەوە دەڵێن "پۆست برێشتیزم"، وەك ئاماژەیەك بۆ تەکنیکی نامۆبوون و دوور وەستانی ئەکتەر لەگەڵ رۆڵەکانیاندا، هەروەك لە شانۆ داستانییەکەی برێشتدا پەیڕەوی دەکرێت.
بەڵام ئەوەمان لەیاد نەچێت، کە ئەم پۆست برێشتە نوێیە، مەبەستم "پۆست مۆدێرنیزم"، بە پێچەوانەی برێشتەوە، بە هیچ شێوەیەك پەیڕەوی بنەما سیاسییەکان ناکات و هیچ جۆرە ئایدۆلۆژییەتێك لە خۆناگرێت.



Post revolution poets and writers

ئەحمەدی مەلا

# شاعیران و نووسەرانی دوای ڕاپەڕین

## لازۆ

ئەدەبی سەردەم

١٤٧
ئەدەبی سەردەم






# مێتامۆرفۆزەکانی نیشتیمان لە دەقە شیعرییەکانی لازۆ

# شازادەی کۆشکی ڕەش

**ئەحمەدی مەلا**

نیشتمان لە ماددەوە دەبێتە لەشێکی زیندوو، لە لەشی زیندووەوە دەبێتە ژنێك خەریکی دوورینی کراس و پانتۆڵە بۆ منداڵەکانی ( لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٤٠). نیشتیمان وەکو جیوە شیکل و شێوەی خۆی دەگۆڕێ. ئەم بێ شیکلییەی کە دەدرێتە چەمکی نیشتیمان خاوەن دەلالاتی خۆیەتی و ئێمەش بە پێی پێویست هەڵوێستەیەکی لەسەر دەکەیەن و دەمانەوێ مانا شاراوەکانی بهێنینە دەنگ.

لە فەرهەنگی شیعریی کوردیدا، رەنگە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە، ئەم موفرەدەیە بە مانا نوێیەکەی، واتە بە مانا سیاسییەکەی ئاودیوی دەقی شیعریمان بووبێت. "وەتەن"ی حاجی لە رێگای خەونێکەوە، وێنەی سوریالیئامێزمان بۆ بەرهەمدەهێنێ " چیایە شێخ و کەوای سەوزە، مێزەری بەفرە| سیواکی چووزەرە رێواسە، تەیلەسانی گەڵا" - "دیوانی حاجی قادری کۆیی : لا ٣٢". رەنگە نیشتمانی شیعریی کوردان

بەرهەمی غوربەتی نالی و خەونی حاجی بووبێت. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیشدا، لە جەنگی جیهانی یەکەم بەدواوە، کورد دەکەوێتە هەوڵی دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسی و ئەمەش لە دەقە شیعرییەکاندا بە وردی رەنگی دەداتەوە. ئەگەر لە رووەیەکەوە، سەرهەڵدانی شوێنی یەکەم لە پێککەوتنی شوێنی دووەمدا سەری هەڵدابێ، وەکو یەکێك لە دەرهاوێشتە سایکلۆژییەکان تاك کە لەم بەرەورووبوونەوەیەدا لە گەڵ کەلتوور و شارستانییەکی دیکەدا دەرکەوتبێت، ئەوە بە زمانی شیعریی ئەم خەون و ئەندێشەیە بەرجەستەبووە و هەوڵێکیشە بۆ بە ماددەکردنی ئەم خەون و خولیایەیە.

(نالی و حاجی)



سەرەتا نیشتیمان وەکو باخچەیەك، وەکو پارچەیەك لە فیردەوس لای شاعیرانی نیو کلاسیسم وێنا دەکرێت و سەرەتاکانی چەکەرە کردنی نیشتیمان بووبێت لە شیعری کوردیدا، وێنەی بەهەشتێکی دووردەستە دووپات دەبێتەوە، بەڵام دواتر بەرگێکی سیاسی، نەتەوایەتی، ئایدیۆلۆژیی دەکرێتە بەر کە لە لای گۆران، دواتریش شێرکۆ بێکەس و پەشێو دەیگەتە دوا سنوور و بەربەرستەکانی. لای ئەم دوو شاعیرە، نیشتمان دوا وێنەی دەدرێتەوە و لە هەموو رەهەندەکانییەوە وێنا دەکرێن. ئەو نیشتیمانە هاوتەریب لە گەڵ کۆستکەوتن و خەون و هیوا و سەرجەم گرفت و تەگەرە جیوپۆلیتەکەکاندا هەڵدەکەن و لە یەك دەخۆنەوە و یەکتر رێکدەخەن. نیشتیمانی سیاسی خاوەن سنووری خۆیەتی، ناسنامەی تایبەتی خۆی هەیە و لە خەباتی سیاسیدا هەندەی دیکە قەوارەی پێ دەدرێت. لە شیعری سیاسیدا، زۆرجار، ئەو نیشتیمانە سیاسییەیە کە شاعیر خەونی پێوە دەبینێ، وەکو ئەوەی شیعر وەکو کەرەسەیەك، با سەربەخۆش بووبێت، ویستبوێتی لە سووچێکی دیکەوە بەرە و ئەو نیشتیمانە سیاسییە هەنگاو بنێت.

ئەم دوا وێنە شیعرییەی کە شیعری سیاسی لە دوا نیوەی سەدەی بیستەم دەکێشرێ، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم بەسەر خودی خۆیدا دەشکێتەوە. واتە سەرباری ئەوەی حەمیمییەتی پێوە دیارە، شیعرییەتی پێوە دیارە، ئایدیالییەتی پێوە دیارە، بەڵام خەمی سیاسی دایڕشتووە، سیاسەتێك کە خودی خۆی دەکەوێتە ژێر چەندین پرسیارەوە. (ئەو گۆڕانکارییانەی بە سەر واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی دێن، ئۆتۆماتیکیانە لە نێو دەقی شیعری و هونەری رەنگدادەنەوە.) لە لایەکی دیکەشەوە، سەرهەڵدانی چەمکی تاك و ئاوڕدانەوەی لەم تێگەیشتنە نوێیە کە ئینسانی کوردی

پێی ئالوودە بووە، نیشتیمان لە چەترێکی کۆگەلییەوە دەیەوێ ببێتە چەتری تاك. لە خوێندنەوەیەکی واقعییانەی رووتەوە دەیەوێ ئاودیوی ویژدان و گەرموگوڕی تاك بێت. نیشتیمان لە بەرگە واقیعییەکەی رووت ناکرێتەوە، بەڵکو رەنگ و بۆیەکەی شەخسی پێ دەدرێت.
هاوتەریب لە گەڵ ئەو وێنانەی کە شیعری سیاسی دەیترنجێنێتە نێو ئەدەبیاتی کوردییەوە، "شوێن"ێکی دیکەش لە دایك دەبێت، تەنانەی دەتەقێتەوە ؛ ئەم شوێنە، بە بێ ویست دژوارە و بە بێ ویستیش حەمیمییە و داماڵراوە لە بەرگە سیاسییە ڕووتەکەی، لە بەرگ و بۆیاغە نەتەوایەتییەکەی، وەکو ئەوەی "نیشتیمان"ێکی دیکە لە دایکبێت کە خۆی لەو نیشتیمانە برینگە جودا دەکاتەوە کە هزری سیاسەت پێشکەشمانی کردووە، وێڕای شیعریی سیاسی.
دەستەواژەی نیشتیمان لە ناوچەی عەربەت و لەودیویش، لە ناوچەی سەقز بەو "ژوورە" دەڵێن کە خاووخێزانی کوردی تیا نیشتەجێ دەبێ. "نیشت" شوێنی نیشتەجێبوونە، ئەو ژوورەیە کە ئاگری تیادەکرێتەوە کە فەرەنسیان زۆر بە ژیریی و وردیی تێرمی" فوایێ" پێ دەبەخشن، مەبەست لەو شوێنە گەرموگوڕییە کە ئەندامەکانی خێزان



ژیانی تیا دەبەنەسەر، تەنانەت لە بەکارهێنانێکی فراوانتریش "فوایێ ناسیۆنال" وەکو نیشتیمان یا وەکو دوڵەتی نەتەوەیی بەکاردێت.
لازۆ لە کۆتایی ئەو دەنگانەوە دەدوێ کە وەختە هیچمان پێ نەڵێن، وەکو ئەوەی نەزۆك خۆیمان پێ نیشان بدەن، وەکو ئەوەی بەرەکەی کرچ بووبێتەوە و لە یارییەکی سیاسی هیچی دیکە نەبووبێت. بە ئاشکرا ئەم دەنگە پێمان دەڵێ :
نیشتیمان هی ئەوانە!
نیشتیمان هی ئەوانە! (لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٢٩)
ئەم دەنگە شیعرییە لەم جیابوونەوەیەوە لە دایك دەبێت، نیشتیمانی ئەویش لە غوربەتەوە سەرهەڵدەدا، ئەگەر بێت و سەیری شوێن و مێژووی نووسینی دەقەکان بکەین، زۆربەیان لە باکووری ئەورووپا نووسراون. ئەو باکوورەی کە باشوور وەکو دەنگێك، وەکو رەنگێك، وەکو زایەڵەیەك، وەکو هێلانەیەك، وەکو بوونەوەرێك، سەرلەنوێ لێیدا دەبووژێتەوە. لەو باکوورە، باکوورەکەی ئێمە زیندوو دەبێتەوە کە لە دیدی جوگرافیای نوێیەوە، ئیدی دەبێتە باشوور.
کەواتە تێگەیشتمان بۆ نیشتیمان دەبێتە دوو بەشەوە، بەشی نیشتیمانی سیاسییە، بەشی دووەمیش نیشتیمانی تاکە، نیشتیمانێکی شیعرییە، زاتییە، دەبێت کەسێکی دیکە، هاوڕێیەیەك،

ئەندامێکی خێزان :

بە دەم گریانەوە کەوتینە زەمکردنی نیشتیمان. (لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٣١)

من بڕوا ناکەم کە شاعیر ئاگای لەوبێت کە لە هەندێ ناوچە نیشتیمان بە ژووری نیشتەجێبوون و حەوانەوە و خەوتن دەڵێن، بەڵام لە ناخی شاعیردا هەمان وێنە دووبارە دەبێتەوە. وەکو ئەوەی وێنەیەکی میناتوری نیشتیمان بقەپێنێ، لە واقیعییەتی برینگی خۆی دابماڵێ و تێکەڵی زیهنییەتی خۆی بکات. "خۆڵ" و "ژوور" ئاماژەیەکی روونن بۆ ئەو گەرموگوڕییەی کە شاعیر دەیەوێ لە نیشتیماندا بەرجەستەی بکات.




مشتێ خۆڵی نیشتیمانم بۆ بێنە دوای بارانبارین
دەمەوێ لێرە لە ژوورەکەمدا نیشتیمان دروست بکەمەوە. ( لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٣٩)

لە یەکێك لە قەسیدە درێژەکان کە تەنها باسی نیشتیمانمان بۆ دەکات لە ژێر ناونیشانی (" یاربوونەوە لە گەڵ نیشتیمان" : لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٢٧)، دەبینین لە نیشتیمان کەسە، کەسێکی مێینییە. دەچێتە دیالۆگکردن لە گەڵی و بیوگرافیای دەنووسێتەوە. ئەم دەقە پێشکەش بە "هاجەرە"کراوە، ئەو "ە" نزیکبوونەوەی کەسێك رادەگەیەنێت، رەنگە لە هەندێ باریشدا ئاماژە بۆ "ة" مێینە بکات کە لە بنەڕەتدا لە زمانی عەرەبی نییەتی، بەڵام لە زمانی کوردی بۆ زیاد دەکرێت. بەڵام بۆچوونی یەکەم زیاتر بە هەند وەردەگرین.

ئێمە بە وردی نازانین ئەم "هاجەرە"کێیە، ئەگەر کەسێکی راستەقینە بێت ئەوە دەبێتە وێنەی ئەودیوی نیشتیمان، ئەگەریش ئاماژە بێت بۆ "هاجەر"ی ئینجیل، ئەوە خوێندنەوەیەکی دیکە هەڵدەگرێت، ئێمە خوێندنەوەی یەکەم وەردەگرین. دوای هەواڵپرسین، تێگەیشتین کە "هاجەر" نەنکی شاعیرە و ئەم شیعرە پێشکەشی ئەو کراوە.

لەم دەقە شیعرییەدا، نیشتیمان خاوەن چەندین سیما و روخسارە. لە لایەك "دووگیانە" و چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێ کە خۆی نوێ بکاتەوە، نۆژەن بێتەوە، چرۆ بکات و سەرلەنوێ لە دایك بێتەوە، لە هەمان کاتیشدا خوێنی کچێنی لە نێوان برایاندا دەڕژێ. ئەگەر یەکەمیان ئاماژەیەك بێت بۆ راپەڕین، دووەمیان ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ شەڕی براکوژی : کوشتن=خوێن=کچێنی.

وێنەی یەکەم :
دەزانم ئێستا نیشتیمان سەری بەستووە
ئاخر ئەو سەری دێشێت
نیشتیمان دەستی بە پشتییەوە گرتووە،
دوو گیانە ئەو ( لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش لا ٣٩)

وێنەی دووەم:
نیشتیمان کچێنی لە شەڕی ئەو دوو برایەدا
بە زۆر برا ( لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤)

ئەم دوو وێنە ئاڵۆزە، دژ بە یەکە هیچ بەرهەمێکی نابێت. "نیشتیمان" لە ڕچەی خۆی لا دەدات، لە گەرم و گوڕیی ماڵەوە دوور دەکەوێتەوە، تیرۆ دەبێ، دەبێتە کائینێکی بێ مێتۆد و بێ بەرهەم.
نیشتیمان کچێنی خۆی لە شەڕی نێوان براکاندا لە دەست دەدا. ئەمە کەوتووترین وێنەیە کە وێنا بکرێت. ئیدی نیشتیمان دەچێتە قۆناغێکی دیکەوە، دەبێتە "نیشتیمانێکی هەمیشە چاوتەڕ" ( لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤١). منداڵەکەی جاران نییە، بەڵکو " قژی شانە دەکرد/ مکیاژی دەکرد" ( لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤٣).
شەڕی نێوان براکان هەموو ئەخلاقێك لە چەمکی نیشتیمان دەسەنێتەوە. ئەگەر جاران "لە دڵی هەر سۆزانییەك نیشتیمانێکی شاراوە" هەبووبێ، ئەوە ئێستا "لە دڵی نیشتیماندا یەك دنیا سۆزانی!"هەیە (لا ٤٤). ئیتر لە ئایدیایەکەوە دەچێتە ژێر پێستی کەسێکی ئاساییەوە، کەسێکی بازاڕیی " هەمیشە سیگارەکان بە ددان دەگرێت و نامەی/ بێشومار بۆ خۆشەویستەکانی دەنێرێت" (لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤٤)
نیشتیمان لەم کەوتنە دڵی دەشکێ و بەو شێوەیە سواری پاس دەبێ، فێری ئەتواری خراپ دەبێت و دەبێتە ئینسانێکی بەد :
"نیشتیمان بە دڵشکاوییەوە
سواری پاس بوو" (لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤٤)

"ئێستا نیشتیمان خەریکی حەشیشەکێشان بووە
بە گۆزە شەراب دەخواتەوە و چوار دەوری پڕ
بووە لە منداڵی زۆڵ" ( لازۆ، شازادەی کۆشکی ڕەش، لا ٤٥)

لێرەوە ئیشکالیاتی نێوان شاعیر و نیشتیمان دەست پێدەکات. ئەم پەیوەندییە دەچێتە دۆخێکی تەنگژە ئامێزەوە. نیشتیمان ئیدی بەرجەستە نییە، شوێنێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو دەچێتە نێو لۆچەکانی زاکیرەوە، نە



رابردووه، نه ئێستایه، نه ئاینده‌شه، به‌ڵكو به‌رگێكی خه‌ونینه له‌به‌ر ده‌كات. لۆركای شاعیر ده‌یگوت "با هه‌موو رێگاكانیش شاره‌زابم/ من هه‌رگیز ناگه‌مه‌وه به قورتوبه"، لازۆ له‌مه‌ڕ نیشتیمانه‌كه‌یه‌وه ده‌ڵێ :" نیشتیمان وه‌كو سێبه‌ری خۆمی لێهاتووه
هه‌ر ده‌ڕۆم و نایگه‌مێ" (لازۆ، شازاده‌ی كۆشكی ره‌ش، لا ٥٠)
به واتایه‌كی دیكه له زاكیره‌ی شاعیر نیشتیمان ده‌كه‌وێته خواره‌وه. یه‌كێك له گرفته‌كانی غوربه‌ت ئه‌وه‌یه: جۆره جودابوونه‌وه‌یه‌ك له نێوان كه‌سی غه‌ریب و نیشتیمان دروست ده‌بێت. جودابوونه‌وه‌یه‌كی هه‌تاهه‌تاییه، سه‌فه‌رێكی یه‌ك دوو رۆژ نییه، به گه‌ڕانه‌وه ریتمی ژیان بێته‌وه شوێن خوی، هاوڕێی و شته به‌رجه‌سته‌كان (ده‌رگا، په‌نجه‌ره، حه‌وشه‌وبان، كۆڵان، جاده..هتد) هه‌موو وه‌كو جاری جاران ده‌كه‌وێته‌وه هه‌ره‌كه‌ت و جووڵه و ژیان. غوربه‌ت هه‌موو پرده‌كان ده‌ڕوخێنێ: خۆ هه‌ڵواسین به زاكیره كه خودی زاكیره‌ش تووشی گۆڕانكاریی دێت و فێڵ له خۆی ده‌كات، ته‌نها خۆ هه‌ڵواسین به زمان ده‌مێنێته‌وه (لای شاعیران) ئه‌گینا هیچ شتێكی دیكه نامێنێ كه به‌رده‌وامیی ببه‌خشێته‌وه ئه‌و په‌یوه‌ندییه‌كه‌ی كه له نێوان شاعیر و نیشتیمان هه‌بووه.
دوو جیهانن له یه‌ك دوور ده‌كه‌ونه‌وه. یه‌كێكیان به‌ره‌و ئاینده، ئه‌وه‌ی دیكه‌شیان به‌ره و ڕابردوو تا ده‌ڕژێته هه‌ور و ناوچه خه‌یاڵییه‌كان. ئه‌م حاڵه‌ته ده‌بێته بڕیارێك لای لازۆ و ده‌ڵێ:

ئیتر نیشتیمان ده‌خه‌مه مه‌زاده‌وه
ماڵه‌كاند ده‌خه‌مه سه‌ر فرۆشتن
ده‌چم بۆ سه‌ر قه‌بران (لازۆ، شازاده‌ی كۆشكی ره‌ش، لا ١٥٠)

دونیای كۆن به ته‌واوی وێران ده‌بێ به بێ ئه‌وه‌ی دونیان نوێمان لێوه سه‌ر هه‌ڵبدات. شاعیر ده‌بێته‌وه منداڵه لاساره‌كه‌ی جاران تا په‌یوه‌ندییه‌كی ره‌مه‌كی، راسته‌وخۆ، بێ بیركردنه‌وه، ته‌نانه‌ت منداڵانه له‌گه‌ڵ نیشتیمان دروست بكات :

چۆله‌كه ده‌كوژم
فیكه له نیشتیمان ده‌كێشم (لازۆ، شازاده‌ی كۆشكی ره‌ش، لا١٥١)



لازۆ دەگاتە دوا بۆچوون و دوا چەمك لەمەڕ ئەم پەیوەندییە دەدۆزێتەوە، بە جۆرێکی دیکە دەکرێ ناوی بنێین "نا پەیوەندی"، یا" سڕینەوەی پەیوەندی".

لەم مێتامۆرفۆزە، نیشتیمان دوا شیکلی وەردەگرێت. وەکو کراسێکی لێ دێت بە هەڵەدیوی بکرێتە بەر. نیشتیمان ئیتر ئەو پانتاییە نییە کە ئاماژە بۆ ناسنانەمەیەك بکات، هاوسۆزی و هاوبەشی و هاوپەیوەندی لە نێوان تاکەکاندا لە سەر بنەمای ئەم ناسنامەیەوە ئەنجام درابێت. بەڵکو سڕینەوەی هەموو شتێکە و تەنانەت چەرمی خاك بەرەوژێر دەبێت و هیچ نامێنێ، بۆیە دیوی ناوەوەی خاکمان بۆ دەکرێتەوە، ئەو دیوەی کە تەنها مردووەکانی لێیە، دیوە تاریکەکەی، دیوە شێدارە بێ رۆحەکەی کە لانەی کرم و زیندەوەرە بێ گوێ و چاوەکانە.

شاعیر بەرە و رووی عەدەم دەبێتەوە. عەدەم بەو مانایەی کە ئیدی ژیان بوونی نامێنێ، رۆشنایی و هەتا و ئاو و با نامێنێ ؛ سڕینەوە و نەمانی رەگەزە بنچینەییەکانی ژیانە. ئەو دەمینێتەوە "ژێر خاکە". ژێر خاکێك کە ئاماژە بۆ ناهۆشیارییەك دەکات کە لە قووڵاییەکانی ویژدانەوە بانگمان دەکات.




چەمکێکە دەکەوێتە دەرەوەی ژیان و مەرگەوە. بانگێکە کە ئاماژە بۆ "بوون" دەکات، بوونی "تاك" بوونی " من" کە بە یەکێك لە چەمکە هەرە بایەخدارەکانی شیعری دوای راپەڕینە :

بانگی هەموو کرمەکانی ژێر خاك
دەکەم
تا هەست بە مانەوەی خۆم بکەم (لازۆ، شازادەی کۆشکی رەش، لا ٨٩)

لە دوای ئەم خوێندنەوە دەکرێ سەرنجەکانمان بەم شێوەیەی لای خوارەوە تۆمار بکەین :

١- نیشتمانی کۆ دەبێتە نیشتیمانی تاك کە لە سەر بناغەی پەیوەندییەکی حەمیمی و تایبەتمەند دروست دەبێت. ئەم وێنەیە تەواو لە گەڵ زاکیرە و یادەوەرییەکان لە پەیوەندی دایە، سنوورەکانی سیاسی تەی دەکات بۆ ئەوەی بەرگێکی شەخسی، زاتی بکاتە بەر. لە زۆر باردا، نووسینەوەی بیۆگرافیای نیشتیمان نووسینەی بیۆگرافای زاتێکە کە تێکهەڵکێشی ڕووداوەکان دەبێت و لە قووڵایی یادەوەرییەکانیشدا رەگەز و توخمی جیاوازمان بۆ دەستنیشان دەکات. رووداوە سیاسییەکان دەچێتە ژێر پێستی یەکێکەوە و بە کەسکردنی نیشتیمان خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات.

٢- کرۆکی ئەم پەیوەندییە لە گەڵ واقیعی سیاسیدا کۆکە بەڵام بە زمانێکی دیکە دەیەوێ یەم پەیوەندییەمان بۆ بنووسێتەوە. واقیعی کۆمەڵایەتی و سەرجەم بارستاییە ئەخلاقییەکان وەکو چاودێر پاسەوانیی ئەم پەیوەندییە دەکەن. پێدانی رەگەزی مێینە بە



نیشتیمان لە دوو خاڵدا خۆیمان بۆ بەیان دەکات ؛ وێنەی مێینەی ئەبەدی نیشتیمان (دایك) وێنە هەرە باوەکەی، لای شاعیر ئەم مێینە خاوەن چەندین روخسارە. رەگەزی مێینەی شاعیر و بەخشینی رەگەزی مێینە (کچۆلەیە، گەورە بوون و بەرەڵابوون) بارستایی ئەخلاقی هەندەی دیکە بارگاوی دەکات.

٣- شیعری دوای راپەڕین دەکرێ بە شێوەیەکی گشتگیر بکرێتە دوو بەشەوە:

ا - بەشێك کە گەمەیەکی تاك لە گەڵ زمان بەرپا دەکات، سەرباری بارستاییە کۆمەڵایەتییەکان ؛

ب - بەشێکیش کە لە هەوڵی گۆڕینی چەمکەکاندایە (نیشتیمان، کۆمەڵ، ئازادی، تاك، سنوور هتد). ئەم دوو بەشە تەواوکەری یەکترین، یەك کار لە سەر ئەوی دیکە دەکات.

دەکرێ پرسیارێکی جەوهەری لێرە بورووژێنین: شیعر چەمك و تێگەیشتنەکان دەگۆڕێ، یا چەمك و تێگەشتنەکان دەبنە هۆکاری سەرهەڵدانی شیعرێکی دیکە کە گەمە لە گەڵ رەگەزەکان بکات و ئاسۆکان فراوانتر بکات؟

شازادەی کۆشکی رەش دەقگەلێکن خۆیان بە کێشە و چەمك و تێگەیشتنەکانەوە خەریکردووە، هەوڵێکە بۆ پێشکەشکردنی جیهانبینییەکی پەخشانئامێز لە رێگای زمانی شیعرییەوە، ئەم هەوڵە لەسەر سنووری گەمە شیعرییەکان رادەوەستێت. موغامەری دەق لای لازۆ، موغامەریەکی واتابەخشینی نوێیە بەو خاکەی لە نیشتیمان پێ دەڵێن، نەك دەقگەلێك کە جیگای نیشتیمان بگرنەوە. دەنگێکە بە هێزەوە دەیەوێ بڵێ منیش نیشتیمانی خۆم هەیە، تەنها "هی ئەوان نییە".

# Stéphane MALLARME (1842-1898)





Stéphane MALLARME (1842-1898)

# Angoisse

Je ne viens pas ce soir vaincre ton corps, ô bête
En qui vont les péchés d'un peuple, ni creuser
Dans tes cheveux impurs une triste tempête
Sous l'incurable ennui que verse mon baiser :
Je demande à ton lit le lourd sommeil sans songes
Planant sous les rideaux inconnus du remords,
Et que tu peux goûter après tes noirs mensonges,
Toi qui sur le néant en sais plus que les morts:
Car le Vice, rongeant ma native noblesse,
M'a comme toi marqué de sa stérilité,
Mais tandis que ton sein de pierre est habité
Par un cœur que la dent d'aucun crime ne blesse,
Je fuis, pâle, défait, hanté par mon linceul,
Ayant peur de mourir lorsque je couche seul.

# دڵەڕاوکە

ئەم شەو نایەم لەشت ببەزێنم، ئەی دڕندە
چی گوناهی دونیایە لە تۆدایە، نە دێم لە
قژی ئاڵودەت تۆفانێکی غەمگین هەڵەکەم
و لە تاو دەردی بێزاریشدا ماچتکەم:
هەر ئەوەندەم لەو پێخەفەت داوایە
خەوێکی سەنگینی بێخەونم پێببەخشێ
لەژێر پەردە شاراوەکانی پەشیمانی بسوڕێتەوە
ئەوجا دەتوانی درۆ ڕەشەکانت تام بکەیت،
تۆ کە لە مردوەکان زیاتر شارەزای فەنابوونی:
وا گوناهە ڕیشەی پاکیم دەخواتەوە و هەر
وەك تۆش هێمای نەزۆکیی پێمەوە دەرخست
کەچی سینگی بەردینی تۆ دڵێکی تێدایە
کە دانی هیچ تاوانێك برینداری ناکات
هەڵدێم، زەرد، تێکشاو، خێوی کفنم راومدەنێت
لە ترسی مردن ئەو دەمەی بەتەنیا دەنووم





سەرجەمی ئەم شیعرە دەربڕینی دڵەڕاوکەیە. مالارمێیە ئیشی لە فۆرم و ناوەڕۆکیشدا کردوە. دڵەڕاوکە بۆ ئەو لە چەند شوێنێك و شیعرێکدا دەکرێ وێنەی هەرچ شتێك بێت. لێرەدا وەها سەیری دڵەڕاوکە دەکات وەك لەشێکی دڕندە کە تا ڕادەی بێئۆمێدی بێزاریی دەکات و سامناکە. لەشێك (دڵەڕاوکە) کە چی گوناهە کردویەتی لە ئاست هەستی شاعیر، ئەگەر ماچشی دەکات، چونکە بەزۆر بۆتە میوانی، لەبەر ئەوەشە چارەسەری بۆی نییە. لێرە دڵەڕاوکە بە لەش وێناکراوە، لەشێکی دڕندە و پڕ ئارەزووی توندو تیژ. هەروەها بە تەختی نووستن تەشبیهی کردوە کە ناهێڵی شاعیر بە باشی بنوێ، خەوی لێبڕیوە، بۆیە داوای لێدەکات لێیگەڕێت بخەوێت ئەگەرچی خەونیش نەبینێت و ئەو دڵەڕاوکەیە لە ژێر ئەو پردە ی(کولە)ی تەختە بەسەرێوە بسوڕێتەوە. کە خەو نەبێ خەونیش نییە و لێرە لە مردوەکان زیاتر لەسەر فەنابوون (مردن) دەزانێ. پاشان کە خۆی بە نەزۆکی دڵەڕاوکە وێنا دەکات و شاعیر وا دەبینێ کە هەرچی هێزە لەوی سەندووە و نەزۆکی کردوە و ناتوانێ هەڵبەست داهێنێ. سینگی بەردینی تۆش ئەی دڵەڕاوکە کە بەزەییت پێمدا نایەت، بە دڵێك نیشتەجێبووە کە تاوانەکانی لە هی هەموو تاوانی تر گەورەترە؛ هەر بۆیە شاعیر هەڵدێ، ڕەنگ زەرد و تێکشکاو و مردن ڕاوی دەنێت، کاتێ بە تەنیا دەنووێ و دڵەڕاوکە دایدەگرێ.

دیارە مالارمێ، بە بڕوای من گشت شاعیرێکی جیدیش، ئەو دڵەڕاوکە ئەزەلییەی هەیە بەرامبەر بە نووسین و داهێنان. هەمیشە ئەو پرسیارە کوشندەیە لەلای هەموو شاعێرێك هەیە "ئایا ژیانم بێ نووسین مانای هەیە؟ ئەو بۆشاییە تەنها بە داهێنان پڕ دەکرێتەوە، جگە لە مەسەلەی کات و نووسین، مەسەلەی ژیان و نووسین، لە هەمووشی گرنگتر مەسەلەی بژێوی و نووسین کە مرۆڤی داهێنەر ناچاردەکات دوایخات. ئەمانە خاڵی سەرەکەین کە ڕۆح دەخەنە بەرهەمی شاعیرێك و دەیان وێنە و سیمبولی پێ دادەهێنن. مالارمێ یەکێکە لەوانەی لە ڕێی ڕەمزییەتەوە کاری زۆری لە وشەکاندا کردووە. لەبەر ئەوە ناتوانین زۆر دەستکاریی هەڵبەستەکانی بکەین دەنا دەبێتە تەفسیرکردن و شێکردنەوە نەك وەرگێڕانی هەڵبەست.


- Mallarmé, Œuvres complètes, Éd. Gallimard, Collection Poésie, Paris, 1966.
- Albert Thibaudet, La poésie de Stéphane Mallarmé : étude littéraire (5e édition), Ed. Gallimard, Paris.1930.
- Éric Benoit, Néant sonore : Mallarmé, ou, (La traversée des paradoxes), Éd. Librairie Droz, Paris, 2007.






Stéphane MALLARME (1842-1898)

# Brise marine

La chair est triste, hélas ! et j'ai lu tous les livres.
Fuir ! là-bas fuir! Je sens que des oiseaux sont ivres
D'être parmi l'écume inconnue et les cieux !
Rien, ni les vieux jardins reflétés par les yeux
Ne retiendra ce cœur qui dans la mer se trempe
Ô nuits ! ni la clarté déserte de ma lampe
Sur le vide papier que la blancheur défend
Et ni la jeune femme allaitant son enfant.
Je partirai ! Steamer balançant ta mâture,
Lève l'ancre pour une exotique nature !

Un Ennui, désolé par les cruels espoirs,
Croit encore à l'adieu suprême des mouchoirs !
Et, peut-être, les mâts, invitant les orages,
Sont-ils de ceux qu'un vent penche sur les naufrages
Perdus, sans mâts, sans mâts, ni fertiles îlots ...
Mais, ô mon cœur, entends le chant des matelots !

# شنەبای دەریا

لەش غەمبارە، ئەفسووس! چی کتێبیشە خوێندمەوە
هەڵبێ! بۆ ئەوێ هەڵبێ! هەستدەکەم باڵندەکان مەستن
ئەوەتان لە نێو کەفی پەنهانی دەریا و بەرزیی ئاسمان!
هیچ، ڕێ لە دڵ ناگرێت خۆی لە دەریا تەرکات
نە ئەو باخچە دێرینانەی لە چاوم ڕەنگیان دەدایەوە
ئای شەو! نە بیابانی ڕووناکیی چراکەشم لەسەر
پەڕەی بەتاڵی سپی بەرگە دەگرێت و نە
ئەو ژنە گەنجەی شیر بە منداڵەکەی دەدات.
دەڕۆم! تۆش ئەی کەشتی فووکە چارۆکەکانت
لەنگەرەکەشت بەرەو شوێنێکی ئەفسووناوی بەرزکەوە!

بێزارییەك، بەر نائۆمێدیی تاڵ دەکەوێ، کەچی
بڕواش بە ماڵئاوایی ڕاوەشانی دەسەسڕەکان دەکات!
لەوانەشە، کۆڵەکەکان خۆیان بن بانگهێشتی تۆفان بکەن
هەر خۆشیان ڕەشەبا بۆسەر کەشتییە نوقمبووەکان بنێرن
ئەوەتا ونبوون، بێ چارۆکە، بێ کۆڵەکە،
و نە دوورگە بە پیتەکانیش دیارن...
وێرای ئەوەش، ئای دڵم، تۆ
هەر گوێت لە سروودی دەریاوانەکانە!



شنەبای دەریا، ناونیشانێکە بۆ کراوەیی، ئەو شنەیە کە لە تەنیشت دەریایەکەوە دەوستی و هەستی پێدەکەی. لەمەیشدا شاعیر هەستی ئەو کرانەوەیە دەکات کە بانگەوازی دەکات بۆ ڕۆیشتن و ڕێ بەخۆی دەدات لەگەڵ کەفی دەریا و شەپۆل و دەریاوانەکان بڕوات و تا ڕادەیەك سەرت هەڵگری. هەموو ڕۆیشتنەکەشی بە خەیاڵە. لە سەدەی نۆزدە هەموو کەس خولیای گەشت نیشتبووە سەری. نووسەران بە گشتیی و شاعیر و هونەرمەندان بەتایبەتی خواستیان زۆرتر بوو. ئەم شیعرەی مالارمێ یەکێکە لە دیوانی "شیعرەکان" کە شاعیر لە لاوێتیدا نووسیویەتی و کاریگەری زۆری بۆدلێری بەسەرەوەیە، بە تایبەتی کۆمەڵە شیعرێکی بۆدلێر بە ناوی "بێزاریی" **Spleen**.

بێزاریی شاعیر بە لەشێکی خەمۆك و بێبەهایی خوێندنەوە ئاشکرایە. لاوازیی ئەو پەیوەندیانەی شاعیر بە دەورو بەری، خەیاڵی هاندەدات گەشت بکات، ئەم گەشتەش بە چاکیی لە کرداری هەڵهاتن و ڕۆیشتن بەکارهاتووە. بەکارهێنانی کەفی پەنهانی، یاخود نادیار بەرزبوونەوەیە بەسەر دۆخی ڕاستی بێتاقەتی شاعیر.

"لەش غەمبارە، ئەفسووس!چی کتێبیشە خوێندمەوە" دیوێکی ئەمدیوی ئەم کوپلەیە دەکاتە ئەوەی چی خۆشی لەشە تامم کرد و چی کتێبە خوێندمەوە و هەر سوودی نییە و بێزارم. هیچ نەما تاقینەکەمەوە، هیچ ڕێ لە دڵم ناگرێت بڕوات و خۆی لە دەریا بدات. ئەگەر هەرچی هەڕەشەشە بێتە ڕێم هەر دەڕۆم، با کۆڵەکەی کەشتییەکان دەستیان لەگەڵ ڕەشەبا تێکەڵکەن و کەشتییەکە نوقمکەن، با هەمووومان نوقم بین، با هیچ دوورگەیەکیش نەیەتە ڕێمان کە ژیانی لەسەر بێت، بەڵام من هەر گوێم لە سروودی دەریاوانەکانە بانگم دەکەن و سوورم لەسەر ئەو گەشتە و هەر دەڕۆم.

لە ڕێی ئەم شیعرەوە مالارمێ گەشتی خەیاڵیی خۆی کردووە دژ بە ڕاستی، دژ بە شتە هیچ و بچووکەکانی ژیان کە هیچ مانایان لەلای نەماوە و لە نامەیەکدا بۆ دایکی لە **30** دیسەمبەری **1859** ئەو بێزارییە قووڵەی دەربڕیوە. وێنەکانی بەکاریشیهێناون

پلەبەندییەکی تێدایە لە بەرزیەوە سەرچاوەیان گرتووە: بەرەو کرانەوە و ئازادیی دژ بە ڕاستی کە لەلای شاعیر دەکەوێتە پلەیەکی بێ مانا. ئەم کرانەوە و ئازادییەش بە نێوەندی باڵندە ڕوونکراوەتەوە. مالارمێ لەم هەڵبەستە هەتا رادەی بەرەوڕووبوونەوەی هەڕەشە هەموو شتێك وەلاوە دەنا بەرەو دەرچوون ئامادەیە، بڕوات ئەگەر دڵنیاش بێت کە لەناو ئەو کەشتییەی ئەوی تێدابێ بەرەو نوقمبوون دەچێ. بێ مانایی وەها قوڵدەبێتەوە کە وێنەی دایك و منداڵ کە هەزار شیعر، لەلای خودی مالارمێش، بە جوانی و ناسکیی باسی دەکەن، کەچی لەم شیعرە مالاَرمیە بە بێزاریی و بە پرۆسەیەکی دووبارەی بێزارکەر تەماشای دەکات. هەر بۆیە ئامادەشە بڕوات و ژنەکەی و منداڵەکەشی بەجێهێڵێت. تەنانەت بەکارهێنانی کرداری "هەڵبێ"، وەك دۆخێکی هاندان و "ئیمرجنسی" خراوەتە پێش چاو، هەڵبێ هەتا بێزاریی نەتیکوشتوە. هەروەها لە وێنەی "لەنگەرەکەت بەرزکەوە" (مەبەست لە لەنگەری کەشتییەکەیە لەو ساتەی لە ئاوەوە بەرزی دەکەنەوە تا کەشتییەکە بکەوێتە جووڵە)، هەمووی گەشتێکی خەیاڵییە کە بە نێوەندییەوە شاعیر لە بێزاریی هەڵدێت، بە چاکیش دیقەتی ئەوە دەدەین کە شاعیر وەك ئیرسێکی ئەزلیی هەموو شاعیران بەرامبەر بە لاپەرە سپییەکانە کە بە بیابان وێنای دەکات لەو وێنانە خراونەتە پێشچاو.

دواجار مالارمێ لە پێناو خەیاڵ واقیعی تێکدەشکاندوە، دەگەڕێ بۆ ئیدیاڵ، بۆ پلەیەکەی بەرزی شعرییەت، لە ڕێی ڕەمزییەتەوە ئەو گەشتە خەیاڵییە دەکات و ئەم هەڵبەستەی داهێناوە.


- Mallarmé, Œuvres complètes, Éd. Gallimard, Collection Poésie, Paris, 1966.
- Albert Thibaudet, La poésie de Stéphane Mallarmé : étude littéraire (5e édition), Ed. Gallimard, Paris.1930.
- Éric Benoit, Néant sonore : Mallarmé, ou, (La traversée des paradoxes), Éd. Librairie Droz, Paris, 2007.






Stéphane MALLARME (1842-1898)

# Don du poëme

Je t'apporte l'enfant d'une nuit d'Idumée !
Noire, à l'aile saignante et pâle, déplumée,
Par le verre brûlé d'aromates et d'or,
Par les carreaux glacés, hélas ! mornes encor
L'aurore se jeta sur la lampe angélique,
Palmes ! et quand elle a montré cette relique
A ce père essayant un sourire ennemi,
La solitude bleue et stérile a frémi.

Ô la berceuse, avec ta fille et l'innocence
De vos pieds froids, accueille une horrible naissance
Et ta voix rappelant viole et clavecin,
Avec le doigt fané presseras-tu le sein
Par qui coule en blancheur sibylline la femme
Pour des lèvres que l'air du vierge azur affame ?

# بەهەرەی شیعر

هەڵتدەگرم، ئەی کۆرپەی شەوێکی ئیدومیٚ
ئەو کاتەی کازیوە نیشتەسەر چرای بەرەبەیان،
ڕەش، باڵ خوێناوی، زەردهەڵگراو، پەڕ وەریو،
لەودیو پەنجەرەی سووتاو بە بۆن و بەرام و زێڕ،
لەودیو شووشە ساردەکانی، ئەفسووس! هێشتا تاریکە
گەڵای شادیش خۆیان راوەشان! کاتیٚ ئەو
سەری پیرۆزی بۆ ئەو باوکە دەرخست، ئەمیش
خەریکبوو خەندەیەکی شەڕانگیز دەربڕیٚ،
وەلیٚ قورسیی و نەزۆکیی تەنیایی هەژانی.

تۆش، بە لایلایە و کچۆڵەکەت و بێگەردی،
بەو پێیە ساردانەت، پێشوازیی لە
لەدایکبوونێکی سەخت دەکەی
دەنگیشت ئاوازێکی نەرم وەبیردەهێنێتەوە،
پەنچەی ماندووشت هەتا دیٚ سینەی دەگوشیٚ
تاکو بەخورڕ سپێتی لەو ژنە پەنهانییە دەتکیٚ
و دەچۆڕێتە سەر ئەو لێوە برسیانەی
وێڵی ئاسۆیەکی کراوەن؟





مالارمێە ئەم هەڵبەستەی لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا نووسیوە. سەرەتای خولیای شاعیرە بۆ دۆزینەوەی دەنگی جیاوازی خۆی لە پاش بۆدلێر. هونەری ڕەمزی و شیعری مالارمێیە تەواو سەربەخۆیە. لەم هەڵبەستەدا، کە یەکێکە لە شیعرە هەرە قورسەکانی مالارمێ چونکە تێکەڵەیەکە لە نێوان دۆخێکی راستی و رەمزییەتی لەدایکبوونی شیعرێك لە شەویکدا کە شاعیر هەموو شەوی بۆ تەرخان کردبوو. لە سەرێکی تریشەوە، شیعر منداڵێکە و شاعیر باوکێتی. تێمی باوکێتی لێرە دوو مەبەستی لە دوایە:
یەکیان ڕاستییە، بەوەی ژانڤییێڤ، کچەکەی مالارمێ، ساڵێك پێش ئەم شیعرە لەدایك بووە. شاعیریش ئەم شیعرەی بەو منداڵە و لەدایکبوونی گرێداوە.
ئەوی تریشیان، باوکیی شاعیرە بۆ خودی شیعرەکەی کە لەدایکبووندایە.
لە کۆپلەی یەکەمدا شیعرێکی نوێ، منداڵیکە و تازە لەدایك دەبێ کە ناسکە و تووشی هەموو جۆرە هەڕەشەیەك دەبێتەوە، بە تایبەتی رەخنە و شاعیر هەڵیدەگرێتە باوەشی. هەروەها نیشانیدەدات کە ئەو شیعرە بەرهەمی شەوێکی سپییە، شەونخونی (شارەزایانی مالارمێ وای بۆدەچن کە مالارمێ مەبەستی شیعری "هیرۆدیات"ە کە پرۆژەیەکی شیعریی گەورە بوو، بە شێوەی شانۆگەریی نووسراوە، چەند پەشێکی لێ نووسی، بەڵام تەواوی نەکرد.). ڕۆژ هەڵێت و دەبینێ کە ژنەکەی خەریکی کچەکەیانە، شیعرەکەشی هەر تەواو نابێت.
شەو کاتی بەرهەمی نووسینی شیعرەکەیە، کازیوەش بەم شێوەیە

شاعر وێنای کردووە. ژوورەکەی لە ناوەوە گەرمە، دەرەوەش هێشتا تاریکە، شووشەی پەنجەرەکەی لە ناوەوە سوتاوە بە گەرمیی بۆن و بەرام و رەنگی زێڕینی کازیوە، لە دەرەوەش پەنجەرەکە بەستویەتی و لەگەڵ تیشکی زێڕێندا ئەوە ئاشکرا دەکات کە شەو چی نووسیبوو. پاشان شاعیر بە باوك وێناکراوە، باوکێکی خوڵقێنەر و سپیایی بە بێگەردی شوبهاندوە و کچی بەکار بردووە بۆ جیاکردنەوەی ئەو کوڕە "شیعرە"ی لەدایك دەبێ. ساردیش بە پێشوازیکردنێکی تێکەڵەیەکی هەست لەلای شاعیر وێناکراوە کە هەر ئەو پرۆژەیە تەواو ناکات. ئەوەی جێی سەرنجیشە وشەی شیعرە کە لە فەرەنسیدا وەها دەنووسرێت: poème کەچی مالارمێ وەك بیەوێ بەهایەك بە لەدایکبوونی ئەو پرۆژە شیعرە بدات بەم شێوەیە نووسیویێتی: poëme.


- Mallarmé, Œuvres complètes, Éd. Gallimard, Collection Poésie, Paris, 1966.
- Albert Thibaudet, La poésie de Stéphane Mallarmé : étude littéraire (5e édition), Ed. Gallimard, Paris.1930.
- Éric Benoit, Néant sonore : Mallarmé, ou, (La traversée des paradoxes), Éd. Librairie Droz, Paris, 2007.




Stéphane MALLARME (1842-1898)

# Feuillet d'album

Tout à coup et comme par jeu
Mademoiselle qui voulûtes
Ouïr se révéler un peu
Le bois de mes diverses flûtes

Il me semble que cet essai
Tenté devant un paysage
A du bon quand je le cessai
Pour vous regarder au visage

Oui ce vain souffle que j'exclus
Jusqu'à la dernière limite
Selon mes quelques doigts perclus
Manque de moyens s'il imite

Votre très naturel et clair
Rire d'enfant qui charme l'air

# لاپەڕەیەکی چکۆلەی ئەلبومێك

لەپڕاو وەك بە تاودانی گەمەیەك
خانم ویستبێتی کەمێك گوێ
لە دەنگی شمشاڵەکانم بگرێ

وامزانی ئەو بڕە وەستانەشم
لەبەردەم دیمەنێك باشبوو
تا سەیری روخسارت بکەم

بەڵێ، ئەو فووەشم بێهودەیە کە
پەنجەی بێدەرەتانی پیریی دەیژەنێ
و هەتاکو ئەوپەڕی دونیای دەگەیەنم
و هەرچی هێزیشمە بە فیڕۆم دا
تاکو لاسایی ئەو پێکەنینە مناڵییە
جوانە و سادیەت بکاتەوە، کە
پڕ بەدڵ باوەشی بۆ شنەبا کردۆتەوە





ئەم شیعرە یەکێکە لە دیوانی "لاپەڕە چکۆلەکانی ئەلبۆمێك" **Feuillets d'album**. ناونیشانی دیوانەکە بە کۆ هاتووە، بەڵام ناونیشانی ئەم هەڵبەستەی ئێرە بە تاك.

مالارمێە لەم شیعرە، وێنەی پیاوێکی پیری بە شاعیر داوە کە شمشاڵی هەمەجۆری هەیە دەیژەنێ بۆ ئەوەی شۆخێکی گەنج گوێی لێبگرێ. دیارە لیرە مەبەستی شمشاڵ ژەنین، لە قسەکردنی دڵە بۆ کچەکە. کچەکە بە مەبەستی یاریکردن بەو، ئەو بۆچوونەی لەلا دروستدەکات کە گوێی لێدەگرێت. ئەویش پێی خۆشە کە لەبەردەم دیمەنێکی سرووشتدا بڕێك لە ژەنین بووەستێ و لەبری ئەوەی لەبەردەم ئەو دیمەنە قسە بۆخۆی بکات، تەماشای کچەکە دەکات و قسە بۆ ئەو دەکات، بەڵام ئەم تەمەنە پیرەی و لەرزۆکی لەشی هەموو هەوڵەکانی بە فێڕۆ دەبات و پیریی ڕێگرە لەبەردەم گەیشتن بەو شۆخە گەنجە و منداڵکارە کە بە پێکەنین وڵامی هەوڵەکانی ئەو دەداتەوە.


**- Mallarmé, Œuvres complètes, Éd. Gallimard, Collection Poésie, Paris, 1966.**

**- Albert Thibaudet, La poésie de Stéphane Mallarmé : étude littéraire (5e édition), Ed. Gallimard, Paris. 1930.**

**- Éric Benoit, Néant sonore : Mallarmé, ou, (La traversée des paradoxes), Éd. Librairie Droz, Paris, 2007.**

